

لە چاپکراوەکانی
ئە نجومەنی نیشتمانیی کوردستان - عێراق
لیژنەی کاروباری یاسایی(٢٠)
دەستوری هەرێمەکان (٣)

# یاسای بنەرەتیی کاتالۆنیا ٢٠٠٦
# ( ئیسپانیا )



وەرگێرانی
پارێزەر/ محمد کاکەیی

پێشەکی و ئامادەکردنی
پارێــــزەر/ طــارق جامبـــاز
ئەندامی پەرلەمانی کوردستان

کوردستان ـ هەولێر
2007

له چاپکراوەکانی
ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان – عێراق
لیژنەی کاروباری یاسایی (٢٠)
دەستووری هەرێمەکان (٢)

# یاسای بنەڕەتیی کاتالۆنیا ٢٠٠٦
# (ئیسپانیا)

وەرگێڕانی
پارێزەر/ محمد کاکەیی

پێشەکی و ئامادەکردنی
پارێزەر/ طارق جمباز
ئەندامی پەرلەمانی کوردستان

کوردستان – هەولێر ٢٠٠٧

ناوی کتێب/ یاسای بنەڕەتیی کاتالۆنیا ٢٠٠٦ (ئیسپانیا)
وەرگێڕانی: پارێزەر/ محمد کاکەیی
پێشەکی و ئامادەکردنی/ پارێزەر/ طارق جمباز
چاپی یەکەم ٢٠٠٧
کوردستان - هەولێر
تیراژ/ ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی
٥٨٧ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

## بەرەو ڕۆشنبیری دەستووریی

# دەستووری هەرێمەکان
# لە وڵاتە فیدرالییەکاندا

لە هەموو وڵاتانی سیستەمی فیدرالیدا جگە لە دەستووری فیدرالی ئەوا لە (٤٨٠) هەرێم، ویلایەت، ناوچە، لاند، کانتۆن،...هتد. دەستووری تایبەتی خۆیانیان هەیە، کە لە (25) وڵاتی فیدرالی دان کە 40٪ سەرتاپای دانیشتووانی دونیا دەگرێتەوە ولە دەستووری هەرێمەکاندا مافەکانیان تێدا-ڕوونترو تۆکمەتر باسیان لێوە دەکرێ و مەرج نیە کۆپی دەستووری فیدرالی بێ، لەهەمان کاتدا نابێ پێچەوانەی دەستووری فیدرالی بێت، بۆ نمونە لە 13 ویلایەتی ئەمریکادا سزای لەسێدارەدان نیە، گەرچی لە 37 ویلایەتی دیکە هەیە بۆ سوود وەرگرتن لە ئەزموونی ئەو وڵاتانە ئەمریکا (51 ویلایەت) وسویسرا (26 کانتۆن) وئەڵمانیا (16 لاند) وهیندستان (27 ویلایەتو 8 ناوچەی فیدرالی)... هتد. دەتوانین لە نێواندا بەراورد بکەین تاکو بزانین دەستەڵاتی هەرێمەکان چەندەو تا چ رادەیەکە؟ چونکە

جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە لەبەرئەوەی هەریەکەیان بە گوێرەی باری کۆمەڵایەتیو مێژوویی‌و جوگرافی‌و ئابوری هاتۆنەتە کایەوە. بۆیە ئێمە دەتوانین پترو زێتر سوود لە وڵاتانی فرە نەتەوەو ئاین وەربگرین‌و لەم بارەوە کە بەشداریم لە کۆنگرەیەکدا لەبارەی پراکتیزەکردنی فیدرالی لە ئیتالیا کردو لە دانیشتنێکدا لەبارەی فرە زمانیی پرسیارێکم لە پرۆفیسۆر (دیڤید کامیدۆن) کە مامۆستای زانکۆی تۆرنتۆیە لە کەنەدا کرد کە گەر هاتوو حکومەتی فیدرالی کۆسپی خستە بەردەم جێبەجێ کردنی زمانی کوردی لەتەك زمانی عەرەبیدا چ بکەین باشە؟ ((گوتی ئێمە لە کەنەدا (25) ساڵە هەوڵدەدەین کە هەردوو زمانی (فەرەنسی‌و ئینگلیزی) پێکەوە بەکاربهێنرێن و تیایدا سەرکەوتوو بووین و ئێوەش لە عێراقدا دەتوانن سوود لە ئەزمونی وڵاتانی فرە زمان وەربگرن. ئەوانەی پێویستە هەردوو زمان بە خوێندنەوەو نووسینەوە بزانن (سیاسەتمەداران و پەرلەمانتاران و وەزیران و دادوەران و کەسایەتیەکان و بازرگانەکان) تاکو کارەکانیان بە رێك‌و پێکی ئەنجام بدەن. مەرج نیە دوکاندارو کرێکارو جوتیار هەردوو زمان بزانن. دەتوانن ئێوەش لە عێراقدا (زمانی کوردی‌و عەرەبی) کە زمانی فەرمین لە واقیعدا بەکار بهێنن ئەمیش پێویستی بە پلان دانان و خۆئامادەکردن هەیەو دەبێ یاسای تایبەت (یاسای زمانی) بۆ

دەربچێ تاکو لە چوارچێوەی یاسایێکی تایبەتمەندا جێبەجێ بکرێت و ئەوانەی پێشیلی دەکەن ئەوانە (سزای نایاسایی دەدرێن)) و لە وڵاتاندا زمان سێ ئاستی هەیە (زمانی ڕەسمی‌و زمانی نیشتمانی‌و زمانە خۆجێیەکان) وبۆ زمانە خۆجێیەکان لە عێراقدا کە تەنیا زمانی عەرەبی بە زمانی فەرمی دەناسراو ئەوانی دیکە زمانی (خۆجێی‌بوون) واتە لە ناوچە جیاجیاکاندا بەکار دەهێنرێن کە یاسایەکە بە ژمارە 74/ 1931 دەرچووە بەڵام هەندێکە لە پەنجا وڵاتدا جگە لە عێراقیش دوو زمانی ڕەسمی لە دەستوورەکانیاندا هەنەو سەرەڕای ئەوەی لەسەر پارەی کاغەزی هیندستان بە (22) زمان لەسەری نووسراوە کە زمانی فەرمین‌و لە هی چین بە (5) و سریلانکا بە (3) زمان‌و سەنگافورا بە (3) زمان و ناسنامەی هاوڵاتیانی سویسریش بە (5) زمان چاپکراوەو... هتد.

دەستووری هەرێمی کاتالونیای ئیسپانی (٢٠٠٦) کە لە (227) ماددە پێکهاتووە گەرچی دەستووری ئیسپانیا لە (169) ماددە پێك دێت سالی پار گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی بەسەر دەستوورەکەی کاتالونیادا داهێنراو دەتوانین دەستووری هەرێمی کوردستان لەگەڵ دەستووری هەرێمەکاندا بەراورد بکەین و دەسەلات و جیاوازی‌و پێکچونیان دەستنیشان بکەین و سوود لە ئەزمونیان وەربگرین. ئەم دەستوورە سێ یەمین دەستووری

هەرێمەکانە کە لیژنەی کاروباری یاسایی لە پەرلەمانی کوردستان بە چاپی دەگەیەنین:-

١- الحالة الخاصة لاقليم سيسيليا (الصقلية) احد اقاليم الجمهورية الايطالية.

٢- دستور ولاية كاليفورنيا الامريكية (١٨٤٨).

٣- یاسای بنەڕەتی کاتالونیای ئیسپانی (٢٠٠٦).

وەدەتوانین بڵێین کە دەستووری هەرێمی کوردستان سێیەمین دەستوورە لە جیهاندا دوای دەستووری سیسیلیا لە ئیتالیاو دەستووری لاندەری باڤاریا لە ئەڵمانیا کە لە هەرێمەکە سیستەمی ئاییندەی وڵاتەکە دابنێ.

بە ئومێد بووین ئەوانەی پسپۆڕو لێزانن و زمانی بیانی دەزانن بەشێك لە دەستووری هەرێمەکانیان بۆ کردباین بە زمانی کوردی، بەڵام زۆر چاوەڕوان بووین و ئەوان زانیوە یەکێکیان بەم کارە رابووبێ و گەر بە کارەکە رابووبێ و ئامادەی کردبێ بۆ چاپ ئەوا ئێمە بە سوپاسەوە بۆی چاپ و بڵاودەکەینەوەو پێشەکیش سوپاسێکی وڵاتپارێزانەی دەکەین.

پارێزەر/ طارق جامباز
ئەندامی پەرلەمانی کوردستان
٢٠٠٧/٥/٢٩

# یاسای بنەڕەتی
# کاتالونیای پاشایەتی

لە پرۆسەیەکی دوورو درێژو ئاڵۆزاوی وەها بۆ ئامادەکردنی "یاسای بنەڕەتی" نوێ زۆر جار ئاسۆی گلۆبال لە دەست دەچێتو بە زۆری دەکەوینە نێو وردەکاریەکانەوە. زۆر جار لەبیر دەکرێت کە ئەم پرۆسەیەی ئامادەکردنی یاسای بنەڕەتی سێ قۆناغی سەرەکی گرنگی بەخۆوە بینیوە: پەسند کردنی لەلایەن پەرلەمان، ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئیسپانیو پەسندکردنی کۆتایی بە ریفراندۆم لەلایەن دانیشتووانی کاتالونیا. بێ گومان، رادەی سەرکەوتنی یان سەرنەکەوتنی، دەکەوێتە سەر ئیتفاقی سیاسی لەسەر دەقە یاسایەکە لەنێوان هێزە سیاسیەکان، بەتایبەتی لە کاتالونیا، بەڵام هەر بەهەمان شێوە دەکەوێتە سەر رادەی بەشداریو پشتگیری کردنی میللی کە لە ئەنجامی ئەو ریفراندۆمە دەکەوێتەوە.

تێگەیشتنی هاوڵاتییان لە یاسای بنەڕەتی زۆر جاران بە خراپی لێکدەدرێتەوە لەلایەن داهێنەرانی ڕای گشتی، بە

خوێندنەوەیەکی خوار خێچ لە چەند راپرسیەکی دیاری کراودا.
بەڵام بێ شك، لە پرۆسەیەکی زۆر درێژو ئاڵۆزاوی وەهادا، بۆ ئامادەکردنی ئەم دەقە یاساییە، مەترسیو ناکۆکیو دوورکەوتنەوەو ناڕەزای، لێرەو لەوێ کارێکی ئاساییە.
هەر لە سەرەتای ئەم پرۆسەیە پارتەکان لە خیتابی سیاسیاندا بۆ ئاراستەکردنی دەنگدەرانیان یاسای هێماکانی خۆیان دەستنیشان کردووە، بە جەخت کردن لەسەر ئەو کێشانە کە بە زۆری ناسنامەی حزبایەتی خۆیان دەردەخەن، تەنانەت زۆر جار موبالەغەیش دەکەن لە کێشەکان، بە کەمکردنەوە لە ناوەرۆکی ئەم یاسایە دوور لە پرنسیپی دەستووریەت یان ئەمرۆکە لەسەر مافە مێژوویەکان کە بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر پاش ١٨ مانگ، پاش گفتوگۆیەکی چڕو پڕ وەدەرکەوتن. ئەو گفتوگۆیە ناوەرۆکێکی سمبۆلی هەبوو زیاتر لەوەی پراکتیکی بێت، نموونەیی کاتالونیا بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا لە ماددەی (١)دا رەنگ دەداتەوە، کاتێ کاتالونیا وەکو نیشتمان وەسف دەکاتو لە ماددەی (٥)یشدا ئاماژە بە مافە مێژوویەکانی دەکات وەکو بناغەی خۆبەڕێوەبردن، ئەو ماددانە زۆربەی پارتە سیاسیەکانی کاتالونیا پاڵپشتی دەکەن تەنیا پارتی میللی نەبێت کە خۆی لە گۆشەیەکی داخراودا ناوە.

بەدەر لە یاسای مەدەنیو یاسای زمانەوانی، کە کەس لەسەری نادوێت، لەوانەیە داوای دەسەڵاتی دی نەکرێت، وەکو بابەتی بەندەرو فرۆکەخانەکان، لە رێگای مافە مێژوویەکانەوە، لە کاتێکدا لەنێو خودی یاسای بنەڕەتی میکانیزمی تر هەبێت.

ناتوانین یاسای بنەڕەتی بکەین بەو گورەپانە کە تیایدا دەسەڵاتی شەرعی دەنگدەران هەڵبوەشێتەوە، لەبیرکراوە کە هاوڵاتی بوون بە تێکڕایی، نەك تەنیا دەنگدەرانی دڵسۆز، ئەوانەی کەوا ئیتیفاق بەلایانەوە گرنگە، کارکردنە لە روانگەی وڵاتەوە نەك لە روانگەی حیزبەوە.

ئێمە نە بۆ نەتەوە پەرستەکان یاسای بنەڕەتی دادەنێینو نەیش بۆ ئەوەی بە دڵی ئەوانەی مەدرید بێت، پێویستە ئەو دەقە یاسایە بۆ کاتالونیای پاشایەتی بێت. نابێت لە کاتی دەرچواندنی ئەو یاسایە بیر لە لایەنە توندڕەوەکانی هەر حزبێك بکەینەوە، پێویستە ئەو دەقە یاسایە بۆ سەرتاپای وڵات بێت، یاسایەك بێت ئاواتی نیشتمانیەکان بێنێتەدیو لەلایەن کومەڵایەتیشەوە پێشکەوتوو بێت، ببێتە ئامرازێکی سوودبەخش بۆ پەرەپێدان بە خود موختاریو باش کردنی گوزەرای خەڵکی.

هیچ حزبێك هۆکاری قورسی بەلاوە نیە بۆ بەرهەڵست کردنی ئەو یاسای بنەڕەتیە، تەنانەت دەربارەی تاکە دەروازیەکیش لەم دەقە یاسایە. ئەو دەقە یاسای هەمووانە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش ناکرێت کەس سەد دەر سەد رازی بێت بەم یاسایە، هەر بۆیەش ناکرێت گوزارشت لە تەواوی راو بۆچوونەکانی حزبە جیاجیاکان بکات، ئەوەی گرنگە، پێویستە رەشنووسی یاسای بنەڕەتی ئامانجە پێشنیار کراوەکان بەشێوەی سەرەکی بەجێ بگەیەنێت، دەسەلاتەکانی ڕوون بکاتەوەو پەرەیان پێبدات، پێویستە کاتالونیا وەکو نیشتمان بزانێت، ماف‌و ئەرکە سەرەکیەکانی لەخۆ بگرێت، بەشداری کردنی ئەنجوومەنی گشتی لە یەکێتی ئەورووپاو ئۆرگانە بڕیاردەرەکانی دەوڵەت‌و دارایی کاتالونیاش زامن بکات.

ڕەشنووسی یاسای بنەڕەتی پەسندکراو لەلایەن لیژنەکان، هەرکاتێ بگاتە ئاستێکی باش، پێشکەوتنی گەورە بۆ خود موختاریمان دەنوێنێت کە رەنگدانەوەی دروستی ئەو میتۆدە بەکارهێنراوەیە. دەقەکانی "پەیمانگای دیراساتی ئۆتۆنۆمی" بوونەتە بناغەیەکی سەرەکی بۆ کارەکانی ئامادەکردنی ئەم دەقەو تێبینیەکانیان لەبەرچاو گیراون سەبارەت بە کەمکردنەوەی، وەکو دەڵێن، خاڵە نادەستووریەکان، چ

ئامادەنەبوونی کۆمەڵگای مەدەنییەکان لە پرۆسەی بەشداری کۆمەڵایەتی هەڵبژاردن لەلایەن حکومەتەوە بەشێوەی سەرەکی کاریگەر بوون تا یاسای بنەڕەتی لە چوارچێوەیدا لیستێک لە مافەکانی هاووڵاتیبوون لەخۆ بگرێت کە گوزارشت لە داخوازییەکانی سەندیکاکان و ڕێکخراوەکانی ژنان و لاوان و کەمئەندامان و خەڵکانی بەساڵاچوو بکات، بە ناوناخن کردنی ئەو مافانەی کە پەیوەندییان بە ژینگەو مردنی بە شەرەف و دەست هێنانی تەکنەلۆژیای نوێوە هەیە.

سەرەڕای گرفتەکان، ئەمجۆرە تێکڕایی پارتەکان، بەدەر لە پارتی میللی، کە بە ویستی خۆی لەو پرۆسەیە خۆی گۆشەگیر کردبوو، بەڵێنی لێبڕاوی بۆ ئەم دەقە یاسایە دەنووسن. لەوانەیە لە مانگی سێپتەمبەر چەند خاڵێکی جیاوازی سەرهەڵبداتەوە، بە تایبەتی بابەتی دارایی و چەند بابەتێکی دی، بەڵام مایەی بەخۆنازینە کە ناکۆکی نێوان پارتە سیاسییەکان نەبێتە مایەی کەمکردنەوەی ئەو خۆشییە و دڵبەزینی ورەی هاووڵاتییان پاش چەند مانگ لە گفتوگۆکردن

**خوان ساورا**

**ڕۆژنامەی وڵات**

٢٠٠٥/٧/٣٠

# یاسای بنەڕەتی
# ئۆتۆنۆمی کاتالونیا ٢٠٠٦

## دیباجە

نەتەوەی کاتالان بەدرێژایی مێژوو، نەوە لەدوای نەوە، وزەو توانایی خۆیان خستۆتەگەڕ بۆ خزمەتکردنی ترادیسیۆنو کەلتوری ئەم خاکە. کاتالونیا پێناسەی زمانو کەلتورێکە، دیمەنێکی بەرجەستە کردووە، چەندین زمانو کەلتوری دیکەی لەباوەش گرتووە، هەمیشە کراوە بووە لەرووی ئاڵوگۆڕکردنی کەلتور لەگەڵ نەتەوەکانی تر، سیستەمێکی مافو ئازادی دروست کردووە، یاسایی تایبەتمەندی هێناوەتە کایەوەو پەرەی بە چێوەیەکی پێکەوە ژیانی هاوکاری داوە کە خوازیاری دادپەروەری کۆمەڵایەتی بووە.

ئەم "یاسا بنەڕەتیە" ڕێچکەی ترادیسیۆنی دەستوورو مافەکانی تری کاتالونیای گرتۆتەبەر، کە لەرووی مێژووەوە

واتای جەمسەری ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی کاتالۆنیەکان دەگەیەنێت.

هەر لە ساڵی ١٧١٤، هەوڵێکی زۆر دراوە بۆ گەڕاندنەوەی دامەزراوە شەرعیەکانی خودموختاری کاتالونیا. هەر لەم ڕوانگە مێژووییەوە، پێکەوە لەگەڵ دامەزراوەکانی تردا، "ئەنجومەنی هەرێمایەتی" ١٩١٤و دامەزراندنەوەی ئەنجومەنی گشتی‌و "یاسایی بنەڕەتی ساڵی ١٩٣٠" و "یاسایی بنەڕەتی" ساڵی ١٩٧٩، نموونەی دیارن، کە تێکڕا سەلماندویانە کە کاتالونیا خوازیارە، پێشان‌و ئەمڕۆ، ممارەسەی مافی ڕەوای خۆی بکات لە خودموختاری.

هەر لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین "یاسای بنەڕەتی" گەنجینەی یادەوەری‌و بیرەوەری ئەوانەیە کە خەباتیان کردووە، یان دوورخراونەتەوە یان تەنانەت لە پێناوی داننان بە مافە نەتەوەییەکانی کاتالونیاو مافە کۆمەڵایەتییەکانی گیانی خۆیان بەخت کردووە.

بەڵام ئەم "یاسایی بنەڕەتی"یە زیاتر لە بیرەوەری، گوزارشت لە داخوازی‌و پرۆژەو خەونە دێرینەکانی کاتالۆنیەکان دەکات، کە هەمیشە ئاواتەخوازن بە ئازادی‌و

سەربەخۆیی بژین، کە ئەمەیش لە پێداویستیەکانی هەر نەتەوەیەکی رووی زەمینی ئەمڕۆدایە.

داواکاری هاولاتیانی کاتالۆنیا لە دیاری کردنی ئایندەی خۆی بەئازادی وەکو گەل مافی خۆیەتی، کە پەرلەمانی کاتالونیا هەردەم بە ئاشکرا دووپاتی کردۆتەوە، لەگەڵ داکۆکی نەتەوەیی یەکدەگرێتەوە، کە بە درێژایی مێژوو دامەزراوەی "ئەنجومەنی گشتی" تا سەدەی هەژدە نوێنەرایەتی کردووەو بەرکار بووە، لەپاشانیشدا سەرلەنوێ ئەو مافە سەندراوەتەوەو بێ دلبڕان وەکو تاقە دەربڕینی مافە مێژوویەکانی کاتالونیا ماوەتەوەو وا ئەمڕۆ دیسانەوە لەم "یاسایی بنەڕەتی"یەدا خۆی دەبینێتەوە.

کاتالونیا، ئەمڕۆ، لە پرۆسەی دروست کردنی نیشتمانی خۆی، تەعبیر لە ویستو بوونی خۆی دەکاتو بەردەوام رووی لە ئاسۆیەکی گەشەو برەو بە ژیانو پێناسەی جەماعی خۆی دەدات. خوازیاری بەرفراوان بوونی خودموختاریە لە رێگای ئەم "یاسایی بنەڕەتی"یەی نوێیەوە.

بەم شێوەیە، ئەم "یاسایی بنەڕەتی"یە ئێستا دامەزراوەکانی نەتەوەی کاتالانو پەیوەندییەکانی لەگەڵ گەلانی ئیسپانیا دیاری دەکات لە چوارچێوەی هاوکاری

ئازادیانە لەگەڵ ئەو نەتەوەو هەرێمانە کە پێکی دێنن، کە هەردەم پێویستە گونجاو بێت لەگەڵ پێشکەوتنی دەوڵەتێکی فرە نەژادو نەتەوە.

هەر بەهەمان شێوە، کاتالونیا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەورووپا دروست دەکات، کە پێویستە هەموو کۆمەڵگا نەتەوەیەکان بەشێوەیەکی گونجاو بەشدار بن لە دامەزراوەکانی بەڕێوەبردن و تەشریعی تا بە شێوەیەکی شیاو هاوکاری بکەن لە دروست کردنی ئەورووپا.

"یاسایی بنەڕەتی" وەکو دەستووری کاتالونیاو دۆڵی ئاران دەناسرێت، کە هاولاَتیانی کاتالونیاو دامەزراوە سیاسی و قانوونیەکان دان بە "دۆڵی ئاران" وەکو واقیعێکی نەتەوەیی و کیانێکی تایبەتمەند دەنێت.

کاتالونیا دەیەوێت لە ڕێگای ئەم دەستوورەوە هەنگاو بنێت بەرەو دیموکراسیەتێك لە جۆری پێشکەوتووترو لەسەر بناغەی یەکسانی لە مافو ئەرکەکانی بە بەشداربوونی هاولاَتیان. ئەم پرنسیبە ئاراستەیە بۆ دەسەلاَتە گشتیەکان، کە لە خزمەتی بەرژەوەندی گشتی و مافەکانی هاولاَتیان دایە کە پێك هاتووە لە مافەکانی خۆشگوزەرانی، جۆرەکانی ژیان، ئاشتی و ئارامی، چێژ وەرگرتن لە هەندێ خزمەتگوزاری

گشتی‌و ماف پاراستنی ژینگە، مافی زامن کردنی سیستەمێك بۆ کۆمەکی گشتی کە یەکسانی‌و یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی دابین بکات، هەروەها مافی دۆزینەوەی سەرچاوەو سامان‌و رەخساندنی هەلەکانی کارکردن، لەگەڵ بەڵێنێکی هەمیشەیی بۆ خەبات کردن لە دژی نا یەکسانی‌و جیاوازی، نا عەدالەت‌و هەژاریی.

ئەم مافانە پێکەوە بە بەرپرسیارێتی تاکە کەس‌و ئەرکی مەدەنی لە بەشداری کردن لە پرۆژەی جەماعی ممارەسە دەکرێت، پێکەوە ئەو کۆمەڵگایە بنیات دەنێن کە خوازیارە خۆی لە روانگەی پرنسیپی لێك نزیك بوون رێك بخات لە رێگای شارەوانی‌و ناوچەو بازنە قەزایەکانەوە، کە بناغەی سیستەمی دامەزراوەیی ئەنجومەنی گشتی پێك دێنن.

خۆبەڕێوەبردنی کاتالونیا بەو بەهاو ئامانجانە بەرجەستە دەبێت کە لە چوارچێوەی کاتالونیا گەشە دەکات‌و کە لە سەرتاپای ئیسپانیاو ئەوروپا پشتگیری لێ دەکرێت، بەتایبەتی، داکۆکی کردن لە فرە زمانی‌و فرە کەلتوریی، کە کاتالونیا زمانی کاتالان وەکو زمانێکی تایبەتی‌و هاوبەشی تێکڕای هاوڵاتیان دادەنێت، بە ڕاگرتنی سەربەخۆیی زمانی رەسەنی خۆی‌و بەکارهێنانیشی بەشێوەیەکی ئاسایی.

ئەم دەقە، دەقی دەستورێکی کەسانی ئازادە بۆ کەسانی ئازاد. ئەم ئازادیە سیاسیانە کە وەدەستمان هێناوە وەکو وڵات هەرگیز نابێت لە دژی ئازادییەکانی تاکە کەسی هاوڵاتیانی کاتالونیا بێت، چونکە بەڕاستی ئەو وڵاتە ئازادە کە هەموو تاکێك بتوانێت بەئازادی تیایدا بژیت‌و تەعبیر لە پێناسەی جیاجیا بکات، بێ هیچ جۆرە پەیوەندیەکی پلەو پایە یان پاشگوێیی لە نێوانیاندا.

لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە لەم دەستوورەدا هاتووە کە:

**یەکەم**- کاتالونیا نیشتمانێکە.

**دووەم**- ئەنجومەنی گشتی (Generalidad) کە لە ساڵی ١٩٣١ سەر لەنوێ دامەزراوەتەوە، هەرگیز لەناونەچووە، هەر هەبووە، چ لە خاکی نیشتمان یان لە تەراوگە، ئەویش بە هیمەتی خۆڕاگری گەلەکەمان‌و دڵسۆزی سەرکردەکانی.

**سێهەم**- کاتالونیا، بە سەلماندنی مافە مێژوویەکانی، گەشەی کردووەو پێگەیەکی نموونەیی هەیە سەبارەت بە ڕەوان‌و کەلتورو مافی مەدەنی‌و ڕێکخستنی ئیداری.

**چوارەم**- کاتالونیا وڵاتێکی دەوڵەمەندە چ لە خاك‌و چ لە مەڵك، هەمەڕەنگی‌و فرەیی پێناسەی دەکات‌و بە درێژایی

چەندین سەدە ئەم فاکتەرانە بۆتە مایەی بەهێزبوونی بۆ پاشەڕۆژ.

**پێنجەم**- کاتالونیا، ئیسپانیا بە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە دەزانێت.

**شەشەم**- کاتالونیا پێکەوە لەگەڵ گەلانی ئیسپانیا بە برایانە دەژێت‌و هاوکاریش لەگەڵ تێکڕای گەلانی جیهان دەکات.

**حەوتەم**- یاسای کاتالان بە شێوەیەکی سەرەکی بە پلە یەك پەیڕەو دەکرێت.

**هەشتەم**- هەمیشە ترادیسیۆنی سیاسی دیموکراسی کاتالونیا ماف‌و ئەرکەکانی بە هەند وەرگرتووە، گرنگی داوە بە زانست‌و زانیاری‌و پەروەردەو یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی‌و یەکسانی ملەتەکانی، بەتایبەتی، ئەمڕۆ گرنگی دان بە یەکسانی لە نێوان ئافرەت‌و پیاوان.

**نۆیەم**- پێویستە هەردەم سوود لە سیستەمە جیهانیەکانی کەیانتن، گواستنەوە، ئۆژمێکردنەوە، توێژینەوەو تەکنەلۆژیا وەربگیرێت، هەروەها پێویستە زەمینە بڕەخسێنێت بۆ پێشکەوتنی یەکجارەکی بۆ کاتالۆنیەکان.

دەیەم- کاتالۆنیا، لەڕێگای دەوڵەتەوە، لە ریزی یەکێتی ئەورووپا، هاوکاری دەکات لە بەهاکانو دابین کردنی خۆشگوزەرانیو پێشکەوتنی ئەورووپاو دۆستایەتیو هاوکاری خۆی پێشکەشی کۆمەڵگاکانو هەرێمە دراوسێکان دەکاتو هەوڵ دەدات بۆ پێکهێنانی هەرێمێکی ئەورووپی سەوود بەخش بۆ گەشەکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانیان.

لەبەر دڵسۆزی بۆ ئەو پرنسیپانەو بۆ بە واقیعی کردنی مافی رەوای کاتالۆنیا لە خۆبەڕێوەبردن، پەرلەمانتارانی کەتەلان پێشنیار دەکەن:

## سەرەتای بەرایی

**ماددەی (١)**

**نەتەوەی کاتالان**

١- کاتالۆنیا نیشتمانێکە.

٢- کاتالۆنیا لە ڕێگەی دامەزراوە تایبەتییەکانی خۆیەوە، وەکو کۆمەڵگەیەکی ئۆتۆنۆمی بە گوێرەی دەستووری ئیسپانیاو ئەم "یاسایی بنەڕەتییە"دا ممارەسەی خودموختاری دەکات.

## ماددەی ( ٢ )

## ئەنجومەنی گشتی Generalidad

١) ئەنجومەنی گشتی سیستەمێکی دامەزراوەییە کە تیایدا بە شێوەیەکی سیاسی خودموختاری (خۆبەڕێوەبردن–و–)ی کاتالونیا رێك دەخرێت.

٢) ئەنجومەنی گشتی Generalidad پێك دێت لە پەرلەمان، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی گشتی، حکومەت و تێکڕای دامەزراوەکانی تر، کە لە بەشی پێنجەمی دەروازەی دووەمدا هاتووە.

٣) شارەوانی، شارەدێیەکان، ناوچەو کیانە ناوچەیەکانی دی کە یاساکان دیاریان دەکات سیستەمی دامەزراوەیی ئەنجومەنی گشتی پێك دێنن، کە وەکو چەند کیانێك دابەش بووەتە سەر ئەو هەرێمانە، بێ ئەوەی کار لە سەربەخۆییان بکات.

٤) گەلی کاتالونیا سەرچاوەی دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتییەو بە پێی دەقەکانی ئەم "یاسایی بنەڕەتی"و دەستووری ئیسپانی ممارەسە دەکرێت.

### ماددەی (٣)

## چوارچێوەی سیاسی

١) پەیوەندیەکانی ئەنجومەنی گشتی لەگەڵ دەوڵەت لەسەر بناغەی پرنسیپی دڵسۆزی دامەزراوەیی ئاڵوگۆڕکردن دامەزراوەو لەسەر پرنسیپی گشتی بەڕێوەدەبرێت، کە بەگوێرەی ئەو پرنسیپە ئەنجومەنی گشتی نیشتمانی لەسەر پرنسیپی ئۆتۆنۆمیو پرنسیپی فرە نەتەوەیی دەوڵەتو لەسەر پرنسیپی دوو قۆڵی ممارەسەی ئەرکەکانی دەکات، بێ بەلاوەنانی بەکارهێنانی میکانزمەکان بەشداری فرەلایەنی.

٢) کاتالونیا پێگەیەکی سیاسیو جوگرافی بەرچاوی هەیە لە یەکێتی ئەورووپادا، هاوبەشە لە بەهاو پرنسیپو ئەو ئیلزاماتانەی کە پێویستن بۆ بەشداری کردن لە پێکهاتەکانی ئەو یەکێتیە.

### ماددەی (٤)

## مافو بنەما سەرەکیەکان

١. پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا پشتیوانی بکات لە ممارەسەکردنی تەواوی ئازادیو مافەکانی تاکو کۆ کە ئەم یاسایی بنەڕەتیەو دەستووری

ئیسپانی و، یەکێتی ئەورووپا و، جاڕی جیهانی مافەکانی مرۆڤ، پەیماننامەی ئەورووپی بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ وئازادییە سەرەکییەکان پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنیو سیاسیەکان و پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە ئابووریو کۆمەڵایەتیو کەلتوورییەکانو تێکڕایی ڕێککەوتننامەو پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان کە دان بە مافو ئازادییە سەرەکیەکان دەنێتو مسۆگەری دەکەن.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا کەشو هەوای شیاو بڕەخسێنن تا ئازادیو یەکسانی تاکو گروپەکان ببێتە حەقیقەتێکی دروستو کارا، پێویستە ئاسانکاری بکات بۆ بەشداری کردنی تێکڕای کەسەکان لە ژیانی سیاسی، ئابوری، کەلتوریو کۆمەڵایەتیو دان بە مافی گەلاندا بنێت بۆ مانەوەو پێشکەوتنی پێناسەی تایبەتی خۆیان.

٣- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا پشتگیری لە بەهاکانی ئازادی، دیموکراسی، یەکسانی، فرەگەریی، ئاشتی، دادپەروەریی، هاوکاریو یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی بکات.

### ماددەی ( ٥ )

## مافە مێژووییەکان

خودموختاری کاتالونیا وەکو نەتەوە لەسەر بناغەی مافە مێژووییەکانی گەلی کاتالانە، لە دامەزراوە مەدەنیو ترادیسیۆنی یاساییەکانیدا، کە ئەم "یاسایی بنەڕەتیە" لەخۆی دەگرێتو مۆرکێکی سەردەمیانەی پێی دەدات لەژێر ڕۆشنایی ماددەی (٢) بنەمای دووەمی ئینتقالیو بنەماکانی دی دەستوور، کە چەند چەمگەلێکن کە بە پێی دان بە پێگەیەکی نموونەیی ئەنجومەنی گشتی دەنرێت سەبارەت بە مافی سیڤیل، زمان، پەروەردە، کەلتورو سیستەمی دامەزراوەیی کە بە گوێرەی ئەنجومەنی گشتی ڕێك دەخرێت.

### ماددەی ( ٦ )

## زمانی تایبەتو زمانە فەرمیەکان

١- کاتالان زمانی تایبەتی کاتالۆنیایە. بەم شێوەیە، کاتالان زمانی بەکارهێنانە لە سەرجەم ئیدارە گشتییەکانو هۆکارەکانی پەیوەندی گشتی لە کاتالونیا، زمانێکە کە بە شێوەیەکی ئاسایی بەکاردەهێنرێت وەکو هۆکارێکی پەیوەندیو فێرکاریی لە خوێندندا.

٢- کاتالان زمانی فەرمیە لە کاتالونیا، زمانی ئیسپانیش، کە زمانی فەرمی دەوڵەتی ئیسپانیە، فەرمیە. هەموو کەسەکان لە کاتالونیا مافی خۆیانە بەکاری بهێنن، هەروەها ماف و ئەرکی خۆیانە هەردوو زمانە فەرمیەکە بزانن. پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا رێوشوێنی پێویست بگرنەبەر بۆ ئاسانکاری لە ممارەسەکردنی ئەم ماف و ئەرکانەو جێبەجێ کردنیان.

٣- پێویستە ئەنجومەنی گشتی و دەوڵەت بۆ ئەم مەبەستە چەند کارێکی پێویست ئەنجام بدەن سەبارەت بە داننان بە فەرمیەتی زمانی کاتالان لە یەکێتی ئەوروپاو ئامادەبوون و بەکارهێنانی ئەو زمانە لە ئۆرگانزمە نێودەوڵەتیەکان و لە پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی بە بوارەکانی کەلتوری یان زمانەوانەیەوە هەیە.

٤- پێویستە ئەنجومەنی گشتی پشتیوانی لەو پەیوەندی و هاوکاریانە بکات لەگەڵ ئەو کۆمەڵگاو هەرێمانە کە کەلتوری زمانەوانی هاوبەشیان لەگەڵ کاتالونیا هەیە. لەم بارەیەوە، ئەنجومەنی گشتی و دەوڵەت،

بەگوێرەی پسپۆڕیتیان ، ڕێکەوتنامەو پەیماننامەو میکانزمەکانی دی ساز دەدەن بۆ هاندانو بڵاوبوونەوەی زمانی کاتالان لە دەرەوە.

٥- زمانی ئۆکسیتانا، کە لە دۆڵی ئاران پێی دەوترێت ئارانێس، زمانی تایبەتمەندی ئەو ناوچەیەو فەرمیشە بەگوێرەی دەقەکانی ئەم "یاسایی بنەڕەتییە".

ماددەی ( ٧ )

## باری سیاسی کاتالانیەکان

١- ئەو هاوڵاتیانەی دەوڵەت کە نیشتەجێی ئیداریان لە کاتالونیایە، هەمان باری سیاسی کاتالونیەکانیان هەیە. دەتوانن ممارەسەی مافە سیاسیەکان بکەن بەگوێرەی ئەم "یاسایی بنەڕەتی"و یاساکانی تر.

٢- ئەو هاوڵاتیانەی دەوڵەت کە لە هەندەرانن‌و دوا نیشتەجێبوونیان لە کاتالونیا بووە، وەکو کاتالونیەکان، هەمان مافی سیاسیان هەیە کە لەم "یاسایی بنەڕەتی" دا دیاری کراوە، ئەو کەسوکارەیان کە هێشتا ئەو پێناسەیان ماوەتەوە،

لەسەر داوای خۆیان، بە شێوەیەکی یاسایی ئەو مافەیان پێ دەدرێت.

**ماددەی ( ٨ )**

## سیمبۆلە نەتەوەییەکان

١- ئاڵاو جەژن‌و سروودەکەی سمبوڵی نەتەوەیی کاتالونیایە.

٢- ئاڵای کاتالونیا هەر ئەو ئاڵای تەقلیدیەیە کە چوار هێڵی سووری لە خوارەوە زەردە، پێویستە لەسەر باڵەخانە حکومیەکان و لەو چالاکیە فەرمیانەش کە لە کاتالونیا ساز دەدرێن هەڵبدرێت.

٣- جەژنی کاتالونیا ڕۆژی یازدەی سپتێمبەرە.

٤- سروودی کاتالونیا "سێگادۆر"ە.

٥- پێویستە پەرلەمانی کاتالونیا لەچوارچێوەی سیمبولەکانی کاتالونیا ئەو دەستەواژە جیاجیایانە رێك بخات‌و نیزامی پرۆتۆکۆڵی بۆیان دیاری بکات.

٦- سیمبۆلەکانی کاتالونیا هەمان چاودێری یاسایی سیمبولەکانی دی دەوڵەتیان هەیە.

ماددەی ( ٩ )

سنوور

خاکی کاتالونیا هەر ئەو سنوورە جوگرافیو ئیدارییەی ئێستای ئەنجومەنی گشتییە (Generalidad) لەکاتی بەرکاربوونی ئەم یاسایی بنەڕەتییەش.

ماددەی ( ١٠ )

پایتەخت

بەرشەلۆنە پایتەختی کاتالونیایە، کە بارەگای هەمیشەیی پەرلەمانو سەرۆکایەتی ئەنجومەنی گشتیو حکومەتە، پەرلەمانو حکومەت دەتوانن لە شوێنی تری کاتالونیا کۆببنەوە بە پێی دەقەکان و پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمانو یاساکان.

ماددەی ( ١١ )

دۆلی ئاران

١- گەلی ئاران بە پێی دەقەکانی ئەم "یاسایی بنەڕەتیە"و ئەنجومەنی گشتی ئارانو تێکڕای دامەزراوە تایبەتیەکانی دی ممارەسەی مافی خۆبەڕێوەبردن دەکات.

٢- هاوڵاتیانی کاتالونیاودامەزراوە سیاسیەکانی خۆی دان بە "ئاران"دا دەنێن وەکو واقیعێکی نەتەوەیی "ئۆکسیتانا" سەبارەت بە تایبەتمەندێتی کەلتوری، مێژوو، جوگرافیو زمانەوانی خۆی، کە ئارانیەکان بە درێژایی سەدەکاندا بەرگریان لێ کردووە. ئەم "یاسای بنەڕەتی" یە دان بەو تایبەتمەندێتیە دەنێت، دەیپارێزێتو ڕێزی لێ دەگرێت، هەروەها دان بە "ئاران" دەنێت وەکو کیانێکی هەرێمایەتی تایبەتمەند لەنێو کاتالونیادا. ئەو تایبەتمەندێتیە لەڕێگای نیزامێکی یاساییەوە دەپارێزرێت.

**ماددەی (١٢)**

## ئەو هەرێمانە کە پەیوەندی مێژوویی و کەلتوری و زمانەوانیان لەگەڵ کاتالونیادا هەیە.

ئەنجومەنی گشتی پێویستە پشتگیری لە پەیوەندییەکانی ئاڵوگۆڕی کەلتوری بکات لەگەڵ ئەو کۆمەڵگاو هەرێمانە کە بەشێکن لە خاکی ئیسپانیا یان لە دەرەوە، کە پەیوەندی مێژوویی و زمانەوانیو کەلتوریان لەگەڵ کاتالونیادا هەیە. لەم بارەیەوە، ئەنجومەنی گشتیو دەوڵەتی ئیسپانیا،

بەگوێرەی پسپۆڕێتیان، دەتوانن ڕێککەوتنامەو پەیماننامەو ئامرازەکانی دی یارمەتیدان لە هەموو بوارەکاندا ساز بدەن.

ماددەی (١٣)

## کۆمەڵگا کاتالانیەکان لە دەرەوە

ئەنجومەنی گشتی بە پێی ئەو ئەحکامانەی کە یاسا دایناوە، پێویستە پشتگیری لە پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی، ئابوری‌و کەلتوری بکات لەگەڵ کۆمەڵگا کاتالانیەکانی دەرەوە، پێویستە کۆمەکی پێویستیان بکات. بۆ ئەو مەبەستە، ئەنجومەنی گشتی، بە گوێرەی دەسەڵاتی خۆی، دەتوانێت ڕێکەوتننامەی هاوکاری ئەنجام بدات لەگەڵ دامەزراوە گشتی‌و تایبەتیەکانی ئەو هەرێم‌و دەوڵەتانە کە کۆمەڵگای کاتالانی تێدایە، دەتوانێت داوا لە دەوڵەت بکات سەبارەت بەو بابەتە ڕێکەوتنامەی نێودەوڵەتی گرێ بدات.

ماددەی (١٤)

## کاریگەریی هەرێمایەتی ڕێساکان.

١- یاساو ڕێساو نیزامەکانی ئەنجومەنی گشتی‌و یاسای مەدەنی کاتالونیا کاریگەری هەرێمایەتی هەیە، بێ زیان گەیاندن بەو ئیستثنائانە کە دەکرێت دابنرێت لەسەر هەر بابەتێ‌و لەو شوێنانە کە یاسایی باری

کەسایەتی یان یاسای دی لە دەرەوەی تەشریعی نیشتمانی بەڕێوەی ببات.

٢- ئەو بیانیاتەی کە ڕەگەزنامەی ئیسپانی وەردەگرن پابەندی یاسای مەدەنی کاتالان دەبن مادامەکی جێی نیشتەبوونیان لە کاتالونیایە، تەنها ئەوانە نەبێت کە بە ویستی خۆیان نایانەوێت.

## دەروازەی یەکەم

## دەربارەی ماف و ئەرک و بنەما سەرەکییەکان

## بەشی یەکەم

## ماف و ئەرکەکان لە بواری مەدەنی و کۆمەڵایەتی.

### ماددەی ( ١٥ )

### مافی کەسەکان

١- هاوڵاتیانی کاتالونیا لێهاتووییان هەیە بۆ ممارەسەکردنی ئەو ماف و ئەرکانە کە دانییان پێدانراوە لەلایەن ئەحکامەکانی ماددەی (٤) برگەی (١) کە ئاماژەی پێ دەکات.

٢- هەموو کەسەکان مافی ژیانێکی شەریف و ئازاد و سەربەخۆییان هەیە کە دوور بێت لە چەوساندنەوە و لە مامەڵەی خراپ و لە هەر جۆرە جیاوازییەک، مافیان

هەیە بە ئازادی پەرە بە کەسایەتی‌و توانای لێهاتوویی خۆیان بدەن.

٢- ئەو مافانەی کە لەم "یاسایی بنەڕەتی"یە بۆ هاولاّتیانی کاتالونیا پارێزراوە دەکرێت کەسەکانی دیش بگرێتەوە لەو چوار چێوەیەدا کە یاساکان دیاریان کردووە.

ماددەی (١٦)

## مافەکانی باری خێزان

بەگوێرەی ئەو مەرجانەی کە یاسا دیاری کردووە هەموو کەسەکان مافیان هەیە لە وەرگرتنی کۆمەکە کۆمەلاّیەتیەکان‌و یارمەتیە گشتییەکان بۆ دابین کردنی ئەرکەکانی خێزان.

ماددەی (١٧)

## مافەکانی منداڵان

منداڵان مافیان هەیە چاودێری پێویست بکرێن بۆ پەرەپێدان بە کەساییەتی‌و خۆشگوزەرانیان لە چوارچێوەی خێزان‌و کۆمەڵدا.

ماددەی ( ١٨ )

## مافی کەسە پیرەکان

کەسە پیرەکان مافیان هەیە لە ژیانێکی شەریف‌و ئازاد دوور لە چەوساندنەوەو مامەڵەی خراپ بژین، بێ جیاوازی بەهۆی تەمەنیان.

ماددەی ( ١٩ )

## مافی ژنان

١- هەموو ژنێك مافی هەیە بە ئازادی پەرە بە کەسایەتی‌و لێهاتوویی توانای خۆی بدات‌و لە ژیانێکی شەریف‌و ئارام‌و سەربەخۆ بژیت کە دوور بێت لە هەر جۆرە چەوساندنەوەو مامەڵەی خراپ‌و جیاوازییەك.

٢- ژنان مافیان هەیە بە یەکسانی لەگەڵ پیاواندا بەشداری بکەن لە سەرجەم بوارە حکومی‌و تایبەتیەکاندا.

ماددەی ( ٢٠ )

## مافی مردنێکی شەریفانە

١- هەموو کەسەکان مافیان هەیە بە شێوەیەکی شەریفانە پرۆسەی مردنی خۆیان ببینن.

١ هەموو کەسەکان مافی ئەوەیان هەیە پێشوەخت ئاگاداربکرێنەوە لەو ڕێنمایانە سەبارەت بەو عملیاتو چارەسەرکردنانەی پزیشکی کە بۆیان دەکرێت، پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت لە چوار چێوەی یاساکاندا، لەلایەن میلاکاتی تەندروستی، بەتایبەتی لەو بارودۆخەی کە نەتوانێت بە شێوەیەکی شەخسی تەعبیر لە ویستی خۆی بکات.

**ماددەی ( ٢١ )**

## ماف و ئەرکەکانی بواری پەروەردە

١ هەموو کەسێك مافی پەروەردەی شیاوی هەیە لە بارێکی یەکساندا، پێویستە ئەنجومەنی گشتی مۆتۆدێکی پەروەردەیی لە بەرژەوەندی گشتیدا دابنێت، بۆ مسۆگەرکردنی ئەم مافانە.

٢ بۆ باوکان و دایکان بەگوێرەی پرنسیپەکانی ماددەی (٣٧) برگە (٤)، ، ئەو مافە مسۆگەرکزاوە کە پێشکەشیان دەکرێت تا منداڵەکانیان چ کوڕ چ کچ پەروەردەیی ئاینیو مۆراڵ وەربگرن کە شیاو بێت لەگەڵ بیروباوەڕیان لەو قوتابخانە حکومیانە کە تێیدا خوێندن عیلمانیە.

٣- دەکرێت سەنتەرەکانی خوێندنی ئەهلی لەلایەن دەوڵەتەوە پشتیوانی لێ بکرێت بەگوێرەی یاسا بۆ زامن کردنی مافەکانی پەروەردە کردن لە بارودۆخێکی یەکساندا.

٤- فێرکردن لە هەموو قۆناغەکانی ئیلزامیو لەو قوتابخانانەی دی کە یاسا دەستنیشان کردووە بە خۆراییە.

٥- هەموو کەسەکان مافی پێکهێنانی پیشەییو هەمیشەیی خۆیان هەیە لەو چوارچێوەیەدا کە یاساکان دیارییان کردووە.

٦- هەموو کەسەکان، لەو هەلو مەرجانەکە یاساکان دیاری دەکەن، مافی دەستەبەرکردنی یارمەتی حکومیان هەیە بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی پەروەردەیی لە هەلومەرجێکی یەکسانیدا بۆ گەیشتن بە قۆناغەکانی خوێندنی باڵا، بەگوێرەی ویستو ئارەزوو سەرچاوە ئابورییەکانی خۆی.

٧- ئەو کەسانەی کە پێویستیان بە پەروەردەی تایبەتی هەیە، مافی ئەوەیان هەیە پشتگیری بکرێنو هەلیان

بۆ برەخسێت تا لە سیستەمی پەروەردەیی وەربگیرێن بەگوێرەی یاساکان.

٨- ئەندامانی کۆمەڵگای پەروەردەیی مافی بەشداربوونیان هەیە لە کاروبارەکانی قوتابخانەو زانکۆکاندا لە چوارچێوەی یاسادا.

مادده‌ی (٢٢)

## ماف و ئەرکەکان لە بواری کەلتوریی

١- هەموو کەسەکان مافیان هەیە لە هەلومەرجێکی یەکسانیدا بەرهەمەکانی کەلتور بخرێتە بەر دەستیان‌و پەرە بە تواناکانی ئەفراندنی تاکە کەس‌و جەماعی بدەن.

٢- هەموو کەسەکان ئەرکی ئەوەیان لەسەرە، رێز لە کەلەپوری رۆشنبیری بگرن‌و بیپارێزن.

مادده‌ی (٢٣)

## مافەکانی بواری تەندروستی

١- هەموو کەسەکان مافیان هەیە لە هەلومەرجی یەکسانی‌و بە خۆڕایی خزمەتگوزاری تەندروستی حکومی پێشکەشیان بکرێت لەچوارچێوەی یاسادا.

٢- بەکارهێنەرانی تەندروستی گشتی مافیان هەیە رێز لە حەزەکانیان بگیرێت سەبارەت بە هەڵبژاردنی پزیشکی پیاو یان ژن یان سەنتەری تەندروستی، بەگوێرەی ئەو مەرجانە کە یاسا دیاری کردووە.

٣- هەموو کەسەکان، سەبارەت بە خزمەتگوزارییە گشتیو تایبەتیەکان مافیان هەیە ئاگادار بکرێنەوە لەو خزمەتگوزاریانە کە پێشکەشیان دەکرێت لەگەڵ پێداویستیەکان بەکارهێنانیان، دەربارەی چارەسەرییەکانی پزیشکانو مەترسیەکانی، بەر لەوەی کە لە سەریان پەیڕەو بکرێت، پێویستە ئاگادار بکرێتە لەو عملیاتانەی کە بۆیان دەکرێتو پەیوەندی بە سەلامەتیو تەندروستیەوە هەیە لە چوار چێوەی یاسادا.

## ماددەی (٢٤)

## مافەکانی بواری خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکان

١- هەموو کەسەکان مافیان هەیە لە هەلومەرجێکی یەکسانیدا لە تۆڕی خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکانی حکومەت کۆمەك بکرێن، پێویستە بەپێی یاسا ئاگادار بکرێنەوە لە جۆری یارمەتیو کۆمەکەکان.

٢- ئەو کەسانەی کە پێویستیان بە خزمەتگوزاری تایبەتە، بۆ ڕاگرتنی سەربەخۆیی کەسایەتی لە چالاکیەکانی ژیانی ڕۆژانەدا، مافیان هەیە چاودێری شیاو بکرێن سەبارەت بە بارودۆخی ژیانیان بە گوێرەی ئەو مەرجانەی کە یاسا دیاری کردووە.

٣- ئەو کەسانە یان ئەو خێزانانە کە لە بارێکی نەداریدا دەژین مافیان هەیە داهاتێکی زامن کراوی هاوڵاتی بوون وەربگرن بۆ مسۆگەر کردنی لایەنی کەمی ژیانێکی شەرەف لە چوارچێوەی یاسادا.

٤- ڕێکخراوەکانی کەرتی کۆمەڵایەتی سێیەم مافیان هەیە ممارەسەی ئەرکەکانیان بکەن لە بوارەکانی بەشداری بوون و هاوکاری کۆمەڵایەتی.

ماددەی (٢٥)

## مافەکانی کارکردن

١- کرێکاران مافیان هەیە خۆیان ڕێك بخەن لە ڕێکخراوە پیشەییەکان و مافیشیان هەیە خزمەتگوزارییە گشتییەکان بە خۆڕایی پێشکەشیان بکرێت.

٢- ئەو کەسانەی کە دوور خراونەتەوە لە بازاڕی کارکردن چونکە پێشیان ناگات یان ناتوانن دووبارە بۆی

بگەڕێنەوەو هۆکاری بژێوی تایبەتیان نیە مافیان هەیە یارمەتیو کۆمەك وەربگرن لە چوارچێوەی یاسادا بەبێ هیچ جۆرە باجێك.

٣- هەموو کرێکاران مافیان هەیە کار بکەنو ممارەسەی پیشەکانی خۆیان بکەن بەو شێوەیەی کە مەرجەکانی تەندروستیو ئاسایشو کەرامەتی کەسایەتیان زامن دەکات.

٤- کرێکاران، یان نوێنەرانیان، مافی زانیاری وەرگرتنو راوێژکاریو بەشداری بوونیان هەیە لە کارگەکاندا.

٥- رێکخراوە سەندیکاییەکانو خاوەن کارەکان مافیان هەیە ممارەسەی ئەرکەکانیان بکەن لە بوارەکانی رێکەوتنی کۆمەلآیەتیو بەشداری کردنو هاوکاری کۆمەلآیەتی.

**ماددەی (٣٦)**

## مافەکانی بواری نشینگە

ئەو کەسانەی کە سەرچاوەی ژیانیان نیە مافیان هەیە نشینگەیەکی شیاویان بۆ دەستەبەر بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە دەسەلآتە گشتییەکان پێویستە بەپێی یاسا سیستەمێکی

٣و نجاو دابنێت بۆ زامن کردنی ئەو مافە بەو مەرجانەی کە یاسا ..اری دەکات.

**ماددەی ( ٢٧ )**

**ئەو مافو ئەرکانە کە پەیوەندیان بە ژینگەوە هەیە.**

١ هەموو کەسەکان مافیان هەیە لە ژینگەیەکی هاوسەنگو سەقامگیرو ڕێزلێگیراو سەبارەت بە تەندروستی بژین، بەگوێرەی ستاندارو ئاستەکانی پاراستنی ژینگە کە یاساکان دیاری دەکەن. مافی ئەوەیان هەیە (کەڵك) لە سەرچاوە سروشتیەکانو دیمەنی سروشتی بە یەکسانی وەربگرن، پێویستە ئەو سەرچاوانە بە شێوەیەکی بەرپرسیار بەکاری بهێننو بە فیڕۆی نەدەن.

١ - هەموو کەسەکان مافیان هەیە بپارێزرێن لە شێوە جیاجیاکانی پیس بوونی ژینگە، بەگوێرەی ئەو ستاندارو ئاستانە کە یاسا دیاری دەکات. بەهەمان شێوە پێویستە لەسەریان هاوکاری بکەن لە مانەوەی سامانی سروشتیو بەشداری بکەن لەو چالاکیانە کە هەوڵی لابردنی شێوە جیاجیاکانی پیس بوونی ژینگە

دەدات بە مەبەستی مانەوەو بەردەوام بوونی ژینگە بۆ نەوەکانی پاشەڕۆژ.

٣- هەموو کەسەکان مافی ئەوەیان هەیە ئاگادار بکرێنەوە لەو زانیارانەی ژینگە کە لەبەر دەستی دەسەڵاتە گشتییەکانە. مافی زانیاری وەرگرتن تەنیا دەکرێت سنووردار بکرێت لەبەر هۆیەکانی نیزامی گشتی لەچوارچێوەی ئەحکامەکانی یاسادا.

**ماددەی ( ٢٨ )**

## ماڵەکانی بەکاربەران و بەکارهێنەران

١- کەسەکان وەکو بەکاربەران و بەکارهێنەرانی موڵک و خزمەتگوزاریەکان مافی پاراستنی تەندروستی و ئاسایشیان هەیە، بەهەمان شێوە مافی وەرگرتنی زانیاری راست و دروستیان هەیە سەبارەت بە کاراکتەرو نرخەکانی بەرهەمەکان و خزمەتگوزارییەکان، مافی نیزامێکی گەرەنتیکراویان هەیە بۆ بەرهەمە کڕاوەکان و ئەو گرێ بەستانە کە بۆ هاوردنیان دەبەسترێت. مافی پاراستنی بەرژەوەندیە ئابوریەکانی خۆیان هەیە لە بەرامبەر رەفتاری ناحەق و کەمتەرخەمی و فرت و فێڵەکان.

٢- بەکاربەران‌و بەکارهێنەران مافیان هەیە ئاگادار بن یان بەشداری بکەن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگای نوێنەرەکانیانەوە لە ئیدارە گشتییەکانی کاتالونیا لەو چوارچێوەیەدا کە یاسا دیاری دەکات.

## بەشی دووەم

## مافەکان لە بواری سیاسی‌و ئیداری

### ماددەی (٢٩)

### مافی بەشداری بوون

١- هاوڵاتیانی کاتالونیا مافی بەشداری بوونیان هەیە لە کاروبارە گشتییەکانی کاتالونیا بە شێوەیەکی یەکسانی، ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگای نوێنەرەکانیانەوە لەو هەلومەرجانە کە ئەم یاسایی بنەڕەتیەو یاساکان دیاری دەکەن.

٢- دانیشتوانی کاتالونیا مافی هەڵبژاردنی نوێنەری خۆیان هەیە لە ئۆرگانە سیاسیەکانی نوێنەرایەتی‌و مافی ئەوەشیان هەیە خۆیان کاندید بکەن بە گوێرەی ئەو مەرج‌و پێداویستیانە کە یاساکان دیاری دەکەن.

٣- دانیشتوانی کاتالونیا مافی گەڵاڵەو پێشکەش کردنی پێشنیاری یاسایان هەیە بۆ پەرلەمان، بەو مەرجانەی کە ئەم یاسایی بنەڕەتیو یاساکانی تر دیاری دەکەن.

٤- دانیشتوانی کاتالونیا مافی بەشداری بوونیان هەیە، راستەوخۆ یان لە رێگای کیانە هاوبەشێکانەوە لە پرۆسەی ئامادەکردنی یاساکانی پەرلەمان، بە پێی ئەو رێوشوێنانە کە نیزامی پەرلەمان دیاری دەکات.

٥- هەموو کەسەکان مافیان هەیە داواکاریو سکاڵا، لەچوارچێوەی یاسادا، ئاراستەی دامەزراوەو ئیدارەی ئەنجومەنی گشتی بکەن، بەهەمان شێوەش دەتوانن ئەو داوا ئاراستەی کیانە ناوچەییەکانی کاتالونیا بکەن، لەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتیانە.

٦- هاوڵاتیانی کاتالونیا مافیان هەیە پشتیوانی لە بانگەشەی راپرسی میللی بکەن کە لەلایەن ئەنجومەنی گشتیو شارەوانیەکانەوە ئەنجام دەدرێن لەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتیان دایە. بەو هەلو مەرجانەی کە یاساکان دیاری دەکەن.

**ماددەی ( ٣٠ )**

## مافەکانی سوود وەرگرتن لە خزمەتگوزارییەگشتییەکان‌و ئیدارەیەکی چوست‌و چالاك

١ هەموو کەسەکان مافی ئەوەیان هەیە کە لە هەل‌و مەرجی یەکسانیدا خزمەتگوزاری گشتی‌و ئابوری بەرژەوەندی گشتی بۆیان دابین بکرێت. پێویستە ئیدارە گشتییەکان جۆرو پێکهاتەی ئەو خزمەتگوزاریانە دیاری بکەن‌و بەسەر بەخۆیی ئەنجامی بدەن.

٢ هەموو کەسەکان مافیان هەیە کە لەلایەن دەسەلاتە گشتیەکانەوە ئاگاداربکرێنەوە لەو کاروبارانە کە تایبەتن بەوان، بەشێوەیەکی بێ لایەنی‌و بابەتیانە، پێویستە کارەکانی دەسەلاتە گشتیەکان گونجاو بن لەگەڵ ئامانجەکانیان.

٣- پێویستە یاساکان هەل‌و مەرجەکانی ممارەسەکردن‌و گەرەنتیەکانی ئەو مافانە کە لە برگەی (١، ٢) ئاماژەی پێ کراوە رێك بخەن.

ماددەی (٣١)

## مافی پاراستنی داتا کەسایەتیەکان

هەموو کەسەکان مافی پاراستنی داتا کەسایەتیەکانیان هەیە لــە ژمـــارە تایبەتیـــەکان لەچوارچـــێوەی دەســـەڵاتەکانی ئەنجومـەنی گشتی، هـەروەها مـافی بـەکارهێنان‌و، پـشکنین‌و چاك کردنەوەیان هەیە. پێویستە دەسەڵاتێکی سەربەخۆ کە لە لایـەنی پەرلەمانـەوە دیـاری بکرێـت بـۆ شـەو نخـونی کـردن سەبارەت بە ڕێزگرتن لەو مافانە کە لە چوارچێوەی یاساکاندا هاتووە.

## بەشی سێهەم

## ماف‌و ئەرکەکانی زمانەوانی

### ماددەی ( ٣٢ )

### ماف‌و ئەرکەکانی زانین‌و فێربوون‌و بەکارهێنانی زمانەکان.

هەموو کەسێك مافی هەیە جیاوازی لەگەڵدا نەکرێت بە هۆی زمانەوە.

ئەو کارە قانوونیانە کە بە هەر یەك لەو دوو زمانە فەرمیانە ئەنجام دەدرێن، کاریگەری یاسایی تەواوی هەیە، بێ ئەوەی بیانووی نەزانینی ئەو زمانە بهێنرێتەوە بەکەڵکی بێت.

### ماددەی ( ٣٣ )

### مافە زمانەوانیەکان لەنێو ئیدارە گشتییەکان‌و دامەزراوە دەوڵەتیەکان

١- هاوڵاتیان مافی هەڵبژاردنی زمانیان هەیە، لە پەیوەندیەکانیاندا لەگەڵ دامەزراوەو ڕێکخراو ئیدارە

گشتییەکان لە کاتالونیا. هەموو کەسێك ئازادە لە هەڵبژاردنی ئەو زمانە فەرمییەکە بەکاری دەهێنێت. ئەم مافە ئیلزامە بۆ تێکڕای دامەزراوەکان‌و، ڕێکخراوەکان‌و ئیدارە گشتییەکانی‌و، ئیدارەی هەڵبژاردنی کاتالونیا، هەروەها ئەو کیانە تایبەتیانەش کە پەیوەستن بەوەوە، بەگشتی، هەر کاتێ کە ممارەسەی ئەرکە گشتییەکانیان بکەن.

٢- هەموو کەسەکان لە پەیوەندییەکانیاندا لەگەڵ ئیدارەی قەزا، داواکاری گشتی، دادنووسی‌و تۆمارگا گشتییەکان ئازادن لە هەڵبژاردنی ئەو زمانە فەرمیە کە بەکاری دەهێنن، هەروەها مافیان هەیە لە وەرگرتنی هەموو دۆکۆمێنتە فەرمیەکان کە لە کاتالونیا دەردەچن بە زمانی داواکراو، بێ ئەوەی پشت گوێ بخرێت یان دوابخرێت لەبەر هۆی زمانی بەکارهێنراو، بێ ئەوەی داوای وەرگێڕانی دەقەکە لێیان بکرێت.

٣- بۆ زامن کردنی مافی هەڵبژاردنی زمان، دادوەران‌و راوێژکاران، داواکاری گشتی، دادنووسان، تۆمارکانی موڵکدارێتی‌و بازرگانی، کارمەندانی تۆماری مەدەنی‌و میلاکاتی ئیدارەی قەزا، بۆ پێشکەش کردنی

خزمەتگوزاریەکان لە کاتالونیا، پێویستە کەسانێك بن کە بە گوێرەی یاسایی بنەڕەتی‌و یاساکانی تر، تا ئاستێکی باش زانایریان هەبێت لە زمانە فەرمیەکان تا بتوانن بەشێوەیەکی رێکوپێك ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن.

٤- بۆ زامن کردنی جێبەجێ کردنی مافی هەڵبژاردنی زمان، کە لە برگەی (١) دا هاتووە، ئیدارەی دەوڵەت کە لە کاتالونیا جێگیرە پێویستە ئەو میلاکاتانەی کەوا لەبەر دەستی دایە زانیاریەکی باشیان لە زمانە فەرمیەکان هەبێت تا بتوانن بە باشی ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن.

٥- هاوڵاتیانی کاتالونیا مافیان هەیە لە پەیوەندیەکانیاندا لەگەڵ ئۆرگانە دەستووریی‌و ئۆرگانە قەزایەکانی دەوڵەت زمانی کاتالان بەکاربهێنن بەگوێرەی ئەو رێوشوێنانە کە تەشریعی پەیوەندیدار دایناوە. پێویستە ئەو دامەزراوانە بە زمانی کاتالان وەلامی ئەو نووسراوانە بدەنەوە کە پێشکەشیان کراوە، نابێت لە کەسی مەبەست داوای وەرگێڕانی نووسراوەکەی بکرێ بۆ زمانی ئیسپانی.

ماددەی ( ٣٤ )

## مافە زمانەوانیەکان لەبواری بەکاربەران و بەکارهێنەران

هەموو کەسەکان مافیان هەیە چ بەزارەکیو چ بە نووسراو بەو زمانە فەرمیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت کە خۆیان هەڵیدەبژێرن بە سیفەتی بەکاربەرانو بەکارهێنەران لە تێکڕایی دامودەزگاکان لە کاتالونیاش پابەندی ئەو ئەرکە زمانەوانیە دەبن لە چوارچێوەی یاسادا.

ماددەی ( ٣٥ )

## مافە زمانەوانیەکان لە بواری فێرکردندا

١- هەموو کەسێك مافی هەیە بەزمانی کاتالان بخوێنێت بە پێی دەقەکانی ئەم یاسایی بنەڕەتیەیە. پێویستە زمانی کاتالان وەکو زمانی پەیوەندیو فێرکردن لە قوناغەکانی زانکۆو غەیرە زانکۆ بەکار بهێنێت.

٢- هەموو قوتابیان مافیان هەیە بە زمانی کاتالان لە قوتابخانەکانی خوێندندا بخوێنن. پێویستە بە باشی زمانی کاتالانو ئیسپانی چ بە زارەکی چ بە نووسین بزانن لە قۆناغەکانی خوێندنی ئیلزامی، هەر کامێك بێت زمانی ئاسایی خۆیو هەر کاتێکیش خرایە بەر خوێندن. فێربوونی زمانی کاتالانو زمانی ئیسپانی پێویستە

ئامادەبوونێکی بەرچاوی هەبێت لە پرۆگرامەکانی خوێندندا.

٣- نابێت قوتابیان بەهۆی زمان لەسەنتەرو گروپی جیاجیادا جیا بکرێنەوە.

٤- ئەو قوتابیانەی کەوا بە گەورەیی دەخرێنە بەر خوێندن، سەبارەت بەو سیستەمی خوێندن لە کاتالونیا، مافی ئەوەیان هەیە کە بەشێوەیەکی تایبەتی پشتیوانی بکرێن‌و رەچاوی باری تێگەیشتنیان بکرێت لە خوێندندا.

٥- مامۆستایان‌و قوتابیان لە زانکۆکاندا مافیان هەیە، چ بە زارەکی‌و چ بە نووسین بەو زمانە فەرمیە گوزارشت بکەن کە خۆیان هەڵیدەبژێرن.

مادەی (٣٦)

**ئەو مافانەی کە پەیوەندیان بە زمانی (ئارانیەوە) هەیە**

١- لە دۆڵی ئاران هەموو کەسێك مافی هەیە کە زمانی ئارانی بزانێت‌و بەکاری بهێنێت، چ بە زارەکی‌و چ بە نووسین، بە زمانی ئارانی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت لە پەیوەندیەکانیدا لەگەڵ ئیدراە گشتیەکان‌و ئەو کیلنە گشتی‌و تایبەتیانە کە پەیوەندیان پێوە دەکات.

٢ - هاوڵاتیانی دۆڵی ئاران ئازادن لە بەکارهێنانی زمانی ئارانی لە پەیوەندییەکانیاندا لەگەڵ ئەنجومەنی گشتی (Generalidad).

٣- پێویستە ئەو مافـو ئەرکانە کە پەیوەندیان بە زمانی ئارانیەوە هەیە بە یاسا دیاری بکرێت.

## بەشی چوارەم

## مافو گەرەنتیەکان یاسای بنەڕەتی

### ماددەی ( ٣٧ )

### بنەما گشتییەکان

١- پێویستە لە دەسەڵاتە گشتیەکانی کاتالونیا یان ئەوانەی کە لە کاتالونیا کارەکانیان ئەنجام دەدەن رێز لەو مافانە بگرن کەوا لە بەشەکانی یەکەمو دووەمو سێهەم پارێزراوە بەگوێرەی سروشتی هەر مافێك.

٢- پێویستە پەرلەمانی کاتالونیا بەیاسا "پەیامی مافـو ئەرکەکان" ی هاوڵاتیانی کاتالونیا پەسەند بکات. پێویستە ئەو بنەمایانەی کەوا پەیوەندیان بەو مافانەوە هەیە کە لە بەشەکانی یەکەمو دووەمو سێهەمی ئەم دەروازەیە هاتووە پەیڕەو بکرێن.

٣- پێویستە پەرلەمانی کاتالۆنیا بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئەو مافانە کە لە بەشەکانی یەکەمو دووەمو سێهەمی ئەم دەروازەیە هاتووە بەیاسا جێبەجێ بکات.

٤- نابێت هیچ کامێك لە بنەمایەکانی ئەم دەروازەیە بلاوبکرێتەوە، یان پەیرەو بکرێن یان لێکبدرێتەوە بە شێوەیەك کە ببێتە مایەی کەم کردنەوە یان سنووردار کردنی ئەو مافە سەرەکیانە کە لە لایەنی دەستووری ئیسپانیو رێککەوتنامەو بەڵێننامە نێودەوڵەتیەکانەوە پارێزراوەو دەوڵەتی ئیسپانیاش پەسەندی کردووە.

مادەی ( ٣٨ )

## چاودێری یاسایی

١- ئەو مافانەی کەوا لە بەشەکانی یەکەمو دووەمو سێهەمی ئەم دەروازەیە پارێزراوە، لەلایەن بەڵێنامەی مافو ئەرکەکانی هاوڵاتیانی کاتالۆنیاو لەلایەن ئەنجومەنی گشتیو یاسایی بنەڕەتی چاودێری دەکرێن لە چوارچێوەی مادەی (٧٦)ی برگەی (٢)ی (أ، ب).

٢- پێشێلکاری ئەو مافانە کە لە بەشەکانی یەکەمو دووەمو سێهەمی ئەم دەروازەیەو بەڵێنامەی مافو

ئەرکەکانی هاوڵاتیانی کاتالونیا پارێزراون، دەبنە ئامانجی تانە لێ گرتن راستەوخۆ لەبەردەم "دادگای گەرەنتیەکانی یاسایی بنەڕەتی‌و دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا، لە چوارچێوەی یاسای دەسەڵاتی قەزایی.

# بەشی پێنجەم
# پرنسیپە سەرەکیەکان

**ماددەی ( ٣٩ )**

**بنەما سەرەکیەکان**

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتی‌یەکانی کاتالونیا سیاسەتە گشتییەکانی بەگوێرەی ئەو پرنسیپە سەرەکیانە کە دەستووری ئیسپانیاو ئەم یاسایی بنەڕەتی‌یە دایناوە بەڕێوەبەرن. پێویستە دەسەڵاتە گشتی‌یەکانی کاتالونیا لەکاتی ممارەسەکردنی سەلاحیاتەکانیان پشتیوانی لە گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست بکەن بۆ زامن کردنی کاریگەرێتی تەواوی دەسەڵاتەکان.

٢- پێویستە بە گوێرەی تەشریعی وەزعی‌و قەزایی کارەکانی دەسەڵاتە گشتی‌یەکان بەسەر بگرێنەوە.

## ماددەی (٤٠)

## پاراستنی کەسەکان و خێزانەکان

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا ئامانجیان باشتر کردنی جۆری ژیانی کەسەکان بێت.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتی یەکانی کاتالونیا بوارەکانی یاسایی و ئابوری و کۆمەڵایەتی خێزانە جیاجیاکان بپارێزن، وەکو ستراکچەری بناغەیی و یەککگرتوویی کۆمەڵایەتی، ویەکەی پێکەوە ژیانی کەسەکان، پێویستە پشتگیری لەو رێوشوێنە ئابوری و پێوەریەی و یارمەتی خێزانەکان بکرێت بۆ مسۆگەر کردنی پێکەوەژیان و راگرتنی باری خێزانی کەسەکان.

٣- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا مافی منداڵان زامن بکەن، بەتایبەتی، پارێزراو بن لە هەر جۆرە چەوساندنەوەو پشت گوێ خستن و مامەڵەی خراپ یان درندایەتی و هەژاریی و ئاکامەکانی، لە تێکڕای ئەو کارانە کە ئەنجام دەدرێن لەلایەن دەسەڵاتە گشتییەکان و دامەزراوە تایبەتیەکان، پێویستە بەرژەوەندی باڵای منداڵان لەپێش هەموو شتێکەوە بێت.

٤- پێویستە دەسەلاّتە گشتییەکان سیاسەتگەلێك بەڕێوەبەرن کە لە بەرژەوەندی ڕزگارکردنی لاواندا بێت. ئاسانکاریان بۆ بکەن لە دابین کردنی کارو بژێوی ژیانی بۆ ئەوەی گەشە بە پڕۆژەی تایبەتی خۆی بداتو بەشداری بکات لە یەکسانی مافو ئەرکەکانی لە ژیان کۆمەلاّیەتیو ڕۆشنبیری.

٥- پێویستە دەسەلاّتە گشتییەکانی کاتالونیا (حمایە)ی یاسایی بۆ کەسە کەمئەندامەکان دەستەبەر بکات و پشتیوانی لە یەکگرتوویی کۆمەلاّیەتی، وئابوری بکرێت. ورێوشوێنی شیاو بگیرێتەبەر بۆ جێگۆڕکێ یان پارمەتیدانی ژینگەی خێزانی بەشێوەی ڕاستەوخۆ.

٦- پێویستە دەسەلاّتەگشتییەکانی کاتالونیا کەسە پیرەکان بپارێزنو ژیانێکی شەریفو سەربەخۆ بۆیان دابین بکرێت تا بەشداری لە ژیانی کۆمەلاّیەتیو ڕۆشنبیری بکەن. پێویستە هەوڵ بدەن کەسە پیرەکان تێکەڵی کۆمەلگا بن لە ڕێگای دانانی سیاسەتێکی گشتی کە لەسەر پرنسیپی هاوکاری نێونەوەیی بناغەکرا بێت.

٧- پێویستە دەسەڵاتە گشتیەکانی کاتالونیا پارێزگاری لە یەکسانی جۆرەکانی هاوسەرگەرێتی بکات بەڕاگرتنی سەربەخۆی جنسی ئەندامەکانی و بەپێی یاسا جۆرەکانی هاوسەرگەرێتیو شێوەکانی تری پێکەوە ژیانو ئاکامەکانی رێك بخەن.

٨- پێویستە دەسەڵاتە گشتیەکانی کاتالونیا پارێزگاری لە یەکسانی هەموو کەسەکان بکەن بە ڕاگرتنی سەربەخۆیی، رەسەنایەتی، بنەچەی نەتەوەیی، توخم، ڕەگەز، ئایین، باری کۆمەڵایەتی یان ئارەستەی جنسی، هەروەها پشتیوانی لە سیاسەتی نەهێشتنی رەگەزپەرستی، دژە سامیەت Xenofobia، homobia و هەر جۆرە گوزارشتێکی دی بکرێت کە هەوڵ بدات دژی یەکسانیو کەرامەتی کەسەکان بێت.

**ماددەی ( ٤١ )**

## یەکسانی لەنێوان رەگەزەکان

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتیەکان پرنسیپی یەکسانی دەرفەتەکان لەنێوان ژنانو پیاواندا مسۆگەر بکاتو بیخاتە بواری جێبەجێ کردنەوە، لە بواری کارکردنو، راهێنانی پیشەییو، بارودۆخەکانی کارکردن، هەروەها

پێویستە ژنان بپارێزن لە هەر چەوساندنەوەیەك لەبەر هۆی دووگیانی یان دایکایەتی.

پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان هەلەکان بڕەخسێنن بۆ بەشداری بوونی ژنان لە تێکڕای سیاسەتە گشتییەکان لە پێناو وەدەستهێنانی یەکسانێکی ڕاستەقینەو کاریگەر لە نێوان ژنانو پیاواندا.

پێویستە سیاسەتە گشتییەکان لەهەر شێوەیەکی توندوتیژی دژی ئافرەتان بکۆڵێتەوە، هەروەها پێویستە لەو کردەوە ڕەگەز پەرستیو جیاکاریانە بکۆڵێتەوە کە دژی ئافرەتان ئەنجام دەدرێن، و پشتیوان بکرێت لە ڕۆڵی ژنان لە بوارەکانی کەلتوری، مێژوویی، کۆمەڵایەتیو ئابووری و هانی بەشداری کردنی گروپو کۆمەڵەکانی ئافرەتان بدرێت لە ئامادەکردنو نرخاندنی ئەو سیاسەتانە.

پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان ڕەچاوی بەهای ئابووری کارکردنو چاودێری بەخێوکردن لە بواری کاری ناومالّو خێزانی بکەن لە کاتی دیاری کردنی سیاسەتە ئابووریو کۆمەڵایەتیەکانیان.

٥- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی شەونخونی بکەن لەپێناو ئازادیئافرەتان‌و یەکلایی کردنەوەی کێشەکانیان و لایەنەکانی سەلامەتی‌و خۆشگوزەرانی جەستەیی‌و دەروونی ئافرەتان رەچاو بکرێت‌و کێشەکانیان چارەسەر بکرێت.

**ماددەی (٤٢)**

## یەکگرتوویی‌و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا ئەو سیاسەتە گشتیانە پەیڕەو بکەن کە پشتیوانی لە یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی دەکات‌و سیستەمێکی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی گشتی بەرفراوان‌و دروست مسۆگەر دەکات، وگونجاو بێت لەگەڵ ئامانجە ئابووری‌و کۆمەڵایەتیەکانی کاتالونیا.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا شەونخونی بکات لەپێناو یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و کاریگەریی کەسەکان‌و ئەو کۆمەڵانە کە پێوستیان بە پاراستن هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە بارێکی نەدارو کەم دەرامەتدا دەژین‌و دوورن لە چاودێری کۆمەڵایەتی.

٣- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان شەونخونی بکات لەپێناو پاراستنی کەرامەتو ئاسایشی تەواوی کەسەکان، بەتایبەتی، ئەوانەی کە زۆرتر زیانیان پێکەوتووە.

٤- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان جۆری خزمەتگوزاری بە خۆڕایی پێشکەش بکاتو چاودێری تەندروستی گشتی مسۆگەر بکات لە چوارچێوەی یاسادا.

٥- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان سیاسەتی ویقائیو هاوبەش پەیڕەو بکات.

٦- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا ڕێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر بۆ دانانی نیزامێکی پەناگە بۆ کەسانی کۆچبەر، وسیاسەتگەلێك بگرنەبەر کە پارێزگاری لە مافو ئەرکەکانی کەسانی کۆچبەر بکاتو هەلی یەکسانیان بۆ برەخسێننو یارمەتیو کۆمەکیان بکەن تا بەشداری بکەن لە کاروباری گشتیدا.

٧- پێویستە دەسەڵاتەگشتیەکانی کاتالونیا شەونخونی بکات لە پێناو پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتیو کەلتووریو ئاینی لە نێوان تێکڕای کەسەکان لە کاتالونیاو لە

پێناو ڕێزگرتن لە فرەیی ئاینیو بیروبۆچونی ئەخلاقیو فەلسەفی کەسەکان، پێویستە پشتیوانی لە پەیوەندییەکانی نێو کەلتووریی بکات لە ڕێگای هاندانو ڕەخساندنی بوارەکانی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری دایەلۆگو گفتوگۆ و دان بە کەلتوری گەلی قەرەجدا بنرێت وەکو پارێزگاری کردن لە واقیعێکی مێژوویی ئەو گەلە.

**ماددەی (٤٢)**

## پەرەپێدان بە بەشداری کردن

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا هانی بەشداری کۆمەڵایەتی بدەن لە ئامادەکردنو جێبەجێ کردنو نرخاندنی سیاسەتە گشتییەکان، وەکو بەشداری تاكو کۆمەڵەکان لە بوارەکانی مەدەنی، کۆمەڵایەتی، کەلتوری، ئابووریو سیاسی بە ڕێزگرتن لە پرنسیپەکانی فرەگەریی، ئازادی دەستپێشخەریو سەربەخۆیی.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان هەوڵ بدەن تا هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن کە ئەنجام دەدرێن بەبۆنەی پرۆسەکانی هەڵبژاردنەوە ئامانجیان هاندانی خەلك

بێت بۆ بەشداری کردن ودەنگدەرانیش زانیاری راستەقینەو بابەتیانەی بێ لایەنی لە هۆکارەکانی راگەیاندن وەربگرن‌و ڕێزیش لە فرەگەریی سیاسی بگرن سەبارەت بەو کاندیکراوانە کە بەشداری لە پرۆسەکانی هەڵبژاردن دەکەن.

ماددەی ( ٤٤ )

## پەروەردەو توێژینەوەو کەلتور

١- پێویستە دەسەڵاتەگشتییەکانی کاتالونیا سیستەمی خوێندن زامن بکات‌و پشتگیری لە پێکهاتەیەکی مرۆیی‌و زانستی‌و تەکنیکی قوتابی بکات لەسەر بناغەی بەها کۆمەڵایەتیەکانی یەکسانی، هاوکاری، ئازادی، فرەگەریی، بەرپرسیارێتی مەدەنی‌و پرنسیپەکان پێکەوە ژیانی دیموکراسی.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا هانی زانیاری‌و فێربوونی زمانی سێهەم بدەن لە دوای قۆناغی خوێندنی ئیلزامی.

٣- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان هانی خێزانەکان بدات بۆ بەشداری کردن لە پرۆسەی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان لە چوارچێوەی کۆمەڵگایەکی

پەروەردەیی‌و ئاسانکاری بکات لە پێناو بەشداری کردن لە چالاکیەکانی پەروەردەیی لە کاتی دەست بەتاڵیدا.

٤- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا پشتیوانی بکات لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی بە کەڵک‌و داهێنانی هونەری‌و مانەوەو بڵاوبوونەوەی کەلپوریی لە کاتالونیا.

٥- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا رێوشوێنی پێویست بگرنەبەر بۆ ئەوەی هەموو کەسەکان سوود بەخش بن لە کەلتورو بەرهەم‌و خزمەتگوزاریەکانی کەلتوری‌و کەلەپوری رۆشنبیری، ئارکیولۆژی، مێژووی، پیشەیی‌و هونەری لە کاتالونیا.

**مادەی ( ٤٥ )**

## بواری سۆسیۆ- ئابووری

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا رێوشوێنی گونجاو بگرنە بەر لەپێناو هاندانی پێشکەوتنی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی لە کاتالونیا لەسەر بناغەی پرنسیپەکانی هاوکاری، یەکگرتوویی، پێشکەوتن‌و سەقامگیری‌و یەکسانی هەلەکانی کارکردن.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا پشتیوانی لە دابەشکردنی داهاتی کەسایەتیو هەرێمایەتیو هاوسەنگ بکەن لە چوارچێوەی سیستەمی خۆشگوزەرانی کاتالان.

٣- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا ڕێوشوێنی گونجاو بگرنەبەر بۆ زامن کردنی مافەکانی کارکردنو سەندیکایی کرێکاران، وهان بدرێن بۆ بەشداری کردن لە کارگەکانو لە تەواوی سیاسەتەکانی کارو پشتگیریکردن لە سەقامگیری لە ژیانی کارکردنو پێگەیاندی کەسایەتی کرێکارانو پاراستنیان لە مەترسیەکانی ڕووداوی کارکردنو ئاسایشو پاکو خاوێنی کارگەو ڕەخساندنی هەلومەرجی شیاو لە شوێنی کار دوور لە جیاکاری لەبەر هۆی ڕەگەز، هەروەها زامن کردنی پشووی پێویستی ساڵانە بە مووچە.

٤- پێویستە ئەنجومەنی گشتی پشتیوانی لە دروست کردنی فەزایەکی کاتالان بکات لە پەیوەندیەکانی کارگرتندا لە بواری بەرهەمهێنانی کە تایبەت بێت بە کاتالونیاو بریکارە کۆمەڵایەتیەکان، پێویستە

نوێنەرایەتی ڕێکخراوە سەندیکاییەکان‌و خاوەنی کارەکان‌و ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی ئامادەییان هەبێت. لەم چوارچێوەیەدا دەبێت دەسەلأتە گشتییەکانی سیاسەتی دایەلۆکی کۆمەلأیەتی‌و گفتوگۆی هاوبەش پیادە بکەن بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی نێو ژیانی کارکردن‌و بەشداری کردن لە پێشکەوتن‌و باشترکردنی سقفی بەرهەمهێنان.

٥- پێویستە ئەنجومەنی گشتی ئاسانکاری بکات بۆ پەرەپێدانی بە چالاکی کۆمپانییەکان بە رەچاوکردنی بەرپرسیارێتی کۆمەلأیەتی کۆمپانیاکە، ئازادی دەستپێشخەری‌و هەل‌و مەرجەکانی کێبڕکێ‌و پارێزگاری لە ئابووری بەرهەمهێنەر‌و چالاکی دامەزراوە تایبەتی‌و ئەهلیەکان بکات چ بچووك یان ناوەنجییەکان. ئەنجوومەنی گشتی پێویستە پشتگیری لە کۆمەڵەکانی هەرەوەزی‌و کۆمپانیاکانی کارگەلی بکات‌و هانی دەستپێشخەریەکانی ئابووری‌و کۆمەلأیەتی بدات.

٦- پێویستە ڕێکخراوە سەندیکایەکان‌و خاوەن کارەکان بەشداری بکەن لە دیاری کردنی ئەو سیاسەتە

گشتیانە کە پەیوەندی پێیانەوە هەیە. پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پشتگیری بکات لە ناوبژیوانیو چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانو بەرژەوەندیەکان لە نێوان بریکارە جیاجیاکانی کۆمەلایەتی.

٧- پێویستە رێکخراوە پیشەیەکانو کۆمەڵەکانی گشتی کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندیە ئابووریو پیشەیەکانی کەرتی سێهەم دەکەن راوێژیان پێ بکرێت لە دیاری کردنی ئەو سیاسەتە گشتیانە کە پەیوەندی بەوانەوە هەیە.

٨- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی، بە لەبەر چاوگرتنی ئەرکە کۆمەلایەتیو کەلتوری وئابووری سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن پارێزگاری لە سەربەخۆیی دامەزراوەیی بکاتو هانی ئەو کیانە بدات تا بەشداری کۆمەلایەتی بکەن لە ستراتیژە ئابووریو کۆمەلایەتییەکانی ناوچە جیاجیاکانی کاتالونیا.

**ماددەی ( ٤٦ )**

## ژینگەو سەقامگیریو هاوسەنگی هەرێمەکان

١- پێویستە دەسەلاتە گشتییەکان شەونخونی بکەن لە پێناو پاراستنی ژینگە لە رێگای گرتنەبەری

سیاسەتگەلێکی گشتی لەسەر بناغەی پەرەپێدان‌و سەقامگیری‌و هاوکاری جەماعی‌و نێو هەرێمایەتی.

٢- پێویستە سیاسەتەکانی پاراستنی ژینگە بەشێوەیەکی سەرەکی ئاراستە بکرێت بۆ کەمکردنەوەی شێوە جیاجیاکانی پیس بوونی ژینگە بۆ دیاری کردنی ستانداروئاستە نزمەکانی پاراستن، بۆ گرتنە بەری رێوشوێنی چارەسەرکردنی پیسبوونی ژینگە، بە بەکارهێنانی سەرچاوە سروشتیەکان بەشێوەیەکی عاقلانە.

٣- پێویستە دەسەلاٌتە گشتییەکانی کاتالونیا کەشوهەوای کاریگەر برەخسێنن بۆ پاراستنی سروشت‌و بایۆلۆژی، هەروەها پشتیوانی لە تەواوی ئامانجەکانی ژینگەوان بکرێت.

٤- پێویستە دەسەلاٌتە گشتییەکان لە کاتالونیا شەونخونی بکەن لەپێناو یەککگرتوویی ئابووری هەرێمایەتی بە پیادەکردنی سیاسەتگەلێکی دروست بۆ زامن کردنی مامەڵەیەکی تایبەتی بۆ ناوچە شاخاویەکان‌و پاراستنی دیمەن‌و بلاج‌و کەنارەکان، هەروەها پشتگیری بکرێت لە چالاکیە کشتوکاڵ‌و

ئاژڵداری‌و دارستانەکان بە شێوەیەکی یەکسانی زەوی‌و زارەکان دابەش بکرێت بەسەر سێکتەرە جیاجیاکانی بەرهەمهێنان.

٥- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا زانیاری دروست لە بواری ژینگە بخاتە بەردەستی هاوڵاتیان‌و پشتیوانی لە پەروەردە بکات لە بواری بەهاکانی مانەوەو پاراستنی ژینگە وەکو کەلەپوری هاوبەش.

ماددەی (٤٧)

## نشینگە

پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان ئاسانکاری بکات لە بواری نشینگە لە ڕێگای پەیداکردنی زەوی‌و عەقاراتی نیشتەجێبوون‌و پشتگیری کردنی نشینگەی گشتی بەرەچاو گرتنی باری ژیانی ئەو گروپ‌و کۆمەڵانە کە زۆر پێویستیان پێیەتی.

ماددەی (٤٨)

## گواستنەوەو ئاسایشی ڕێگاوبان

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا سیاسەتگەلێك دابڕێژێت دەربارەی گواستنەوەو گەیاندن کە بناغە کرابێت لەسەر پێوەرەکانی

پشتگیری کردن لە بەکارهێنانی گواستنەوەی گشتیو هەوڵی باشترکردنیان.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا، بەشێوەیەکی سەرەکی، ڕێوشوێنی شیاو بگرێتەبەر بۆ زیاد کردنی چاودێری ئاسایش ڕێگاوبانەکانو کەمکردنەوەی ڕووداوەکانی هاتووچۆ، بەتایبەتی، بڵاوکردنەوەی ڕێنمایەکانی پەروەردەیی لە بابەتی ڕێگاوبانو چاودێریی کردنی قوربانیەکان.

**ماددەی (٤٩)**

## پاراستنی مافی بەکاربەرانو بەکارهێنەران

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا تەندروستیو ئاسایشو مافو بەرژەوەندیە شەرعیەکانی بەکاربەرانو بەکارهێنەران بپارێزرێت.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا ئامرازەکانی ناوبژیوانی لە بابەتی بەکاربەران دابین بکات، هەروەها پشتیوانی لە ڕێکخراوەکانی بەکاربەرانو بەکارهێنەران بکات.

ماددەی ( ٥٠ )

## پشتگیری و بڵاوکردنەوەی زمانی کاتالان

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتیەکانی کاتالونیا زمانی کاتالان بپارێزن‌و پشتیوانی لێ بکەن لە گشت بوارو سەکتەرەکان‌و پشتگیری بکرێت لە بەکارهێنانی‌و بڵاوکردنەوەو فێربوونی، هەروەها بەهەمان شێوە پێویستە زمانی "ئارانی"یش بپارێزرێت.

٢- پێویستە حکومەتی ئەنجومەنی گشتی، زانکۆکان، دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا، لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانیاندا، رێوشوێنی گونجاو بگرنەبەر لەپێناو زامن کردنی بەکارهێنانی زمانی کاتالان لە سەرجەم چالاکیەکانی فێرکاری‌و توێژینەوە.

٣- پێویستە سیاسەتەکانی پشتیوانی کردنی بڵاوبوونەوەی زمانی کاتالان سەرتاپای دەوڵەتی ئیسپانی‌و یەکێتی ئەورووپاو تێکڕای جیهان بگرێتەوە.

٤- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکان پشتیوانی لەوە بکەن کە تەواوی ئەو زانیاریانەی سەر بلیت‌و کاغەزو پسولەو رێنمایەکانی بەکارهێنانی کەلوپەلەکان کە لە کاتالونیا دابەش دەکرێت بە زمانی کاتالان بێت.

٥- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی، ئیدارەی ناوخۆیی‌و دامەزراوە گشتییەکانی کاتالونیا، ئەو کۆمپانیاو دامەزراوانە کە پیوەی پەیوەستن لە کاروباری ناوخۆییان‌و لە پەیوەندیەکانیاندا زمانی کاتالان بەکار بهێنن.

٦- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا بەکارهێنانی زمانی ئاماژەکانی کاتالان (برایل) زامن بکەن لەگەڵ رخساندنی هەلومەرجی یەکسان بۆ ئەو کەسانەکە بەهۆی کەم ئەندامی لەشیان پێوستیان بە یارمەتیە بۆ هەڵبژاردنی ئەو زمانە، پێویستە ئامانجی پرۆگرامەکانی خوێندن‌و پاراستنی لەسەر بناغەی رێزگرتن بێت.

٧- پێویستە دەوڵەت بە گوێرەی دەقەکانی دەستوور، پشتیوانی بکات لە پیادەکردنی ئەو پرنسیپانە کە لەم مادەیەدا هاتووە لەگەڵ دابین کردنی ئامرازەکانی هەماهەنگی‌و هاوکاری بۆ ئەوەی ئەم پرنسیپانە زیاتر کاریگەر بن.

ماددەی ( ٥١ )

## هاوکاریو پشتیوانی کردنی ئاشتیو پێشکەوتن

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پشتیوان لە ئاشتیو سەقامگیری لە جیهاندا بکات.

٢- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پشتیوان لە سیاسەتەکانی هاوکاریو پێشکەوتنی گەلان بکاتو پرۆگرامەکانی کۆمەکی مرۆیی بە پەلە دابڕێژێت.

ماددەی ( ٥٢ )

## هۆکارەکانی گەیاندنی کۆمەڵایەتی

١- پێویستە لەسەر دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالۆنیا بارودۆخی لەبار بڕەخسێنێت بۆ مسۆگەر کردنی ئاگاداربوونو وەرگرتنی زانیاری دروست لە هۆکارەکانی گەیاندن کە دەبێت هەمیشە ناوەڕۆکەکانی ڕێز لە کەرامەتی کەسەکانو فرەگەرەیی سیاسی، کۆمەڵایەتی، کەلتوریو ئاینی بگرن. پێویستە هۆکارەکانی راگەیاندنی حکومی لە زانیاریەکانیدا بێ لایەن بنوێنێت.

٢- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا هەلومەرجی گونجاو بڕەخسێنێت بۆ زامن کردنی خزمەتگوزاریەکانی رادیۆو تەلەفزیۆن لە ناوچەکانی کاتالونیا بەبێ جیاوازی.

ماددەی (٥٣)

## سوود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای راگەیاندن و گەیاندن

١- پێویستە دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا ئاسانکاری بکەن لە دەرخستنی زانیاری کۆمەڵگای راگەیاندن و زەمینە خۆش بکات بۆ سوود وەرگرتن لە گەیاندن و تەکنەلۆژیەکانی بواری راگەیاندن، لە هەلومەرجی یەکسانیدا، لە تێکڕای بوارەکانی کۆمەڵایەتی و هەوڵ بدەن تەکنەلۆژیا لە خزمەتی کەسەکاندا بێت و بە سلبی کارنەکاتە سەر مافەکانیان.

٢- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پشتیوانی لە پێکهاتەی توێژینەوەو نوژەنەکردنەوەی تەکنەلۆژیەکان بکات تا ئەو پێشکەوتنە کە کۆمەڵگاکانی زانیاری و راگەیاندن پێشکەش دەکەن هاویەشی بکات لە باشتر کردنی گوزەران و یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی.

**ماددەی ( ٥٤ )**

## یادەوەری مێژوویی

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتیو تێکرای دەسەڵاتە گشتییەکانی کاتالونیا شەونخونی بکەن لە پێناو پەیداکردنی زانیاریو بەردەوامی مانەوەی یادەوەری مێژوویی کاتالونیا وەکو کەلەپورێکی جەماعی کە باشترین بەڵگەش ئەو بەرگریو خەباتەیە کە لەپێناو ئازادیە دیموکراسیەکانو مافە نەتەوەییو کومەڵایەتیەکانی کراوە. لەبەر ئەم ئامانجە، پێویستە رێوشوێنی شیاوو دەستپێشخەری دامەزراوەیی پێویست بگیرێتەبەر لەپێناو دانپێدانانو گەڕاندنەوەی ڕێزو ئیعتبار بۆ تەواوی ئەو هاوڵاتیانە کە دووچاری راونان هاتوون لە ئەنجامی داکۆکی کردنی لە دیموکراسیو خودموختاری کاتالونیا.

٢- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی شەونخونی بکات تا یادەوەریەکانی مێژوویی بکرێتە سمبوڵی هەمیشەیی گیانی لێبوردەییو تەسامحو بەها دیموکراسیەکان بپارێزرێتو ژیانی تۆتالیتاریزم رەت بکرێتەوەو دان بە خەباتی ئەو کەسانە بنرێت کە لە ئەنجامی راونانیان دووچاری زەبرو زەنگ هاتوون بەهۆی بیرو بۆچوونی سیاسیو ویژدانی.

## دەروازەی دووەم
## دەربارەی دامەزراوەکان
## بەشی یەکەم

**ماددەی ( ٥٥ )**

### بنەما گشتییەکان

١- پەرلەمان نوێنەرایەتی گەلی کاتالونیا دەکات.

٢- پەرلەمان ممارەسەی دەسەڵاتی تەشریعی و بودجەی ئەنجوومەنی گشتی پەسەند دەکاتو کۆنترۆلی کاروباری سیاسیو چاودێری حکومەت دەکات. پەرلەمان ئەو باڵاخانەیەیە کە تێیدا بە ئاشکرا تەعبیر لە فرەگەرەیی دەکرێتو گفتوگۆ سیاسیەکانیشی بە ئاشکرا دەبێت.

٣- پەرلەمان پارێزراوە.

ماددەی ( ٥٦ )

## نیزامی هەڵبژاردن و پێکهاتەکەی

١- ژمارەی ئەندامانی پەرلەمان لە سەد ئەندام کەمتر نابێت و لە سەدو پەنجاش زیاتر نابێت، بۆ ماوەی چوار ساڵ لەڕێگای دەنگدانێکی گشتی، ئازاد، یەکسان، نهێنی و راستەوخۆوە هەڵدەبژێردرێن بەگوێرەی ئەم یاسایی بنەڕەتی و تەشریعی هەڵبژاردن.

٢- سیستەمی هەڵبژاردن نوێنەرایەتی رێژەییەو نوێنەرایەتی سەرتاپای ناوچەکانی خاکی کاتالونیا مسۆگەر دەکات. ئیدارەی هەڵبژاردن سەربەخۆیەو شەفافیەتو بابەتیانە پرۆسەی هەڵبژاردن زامن دەکات. نیزامی هەڵبژاردن بەپێی یاسایەکی پەرلەمانی رێك دەخرێت و لە دەنگدانێکی کۆتایی تەواوی دەقەکە پەسەند دەکرێت لەلایەن زۆرینەی ٣/٢ی ئەندامەکانیەوە.

٣- هاولاتیانی کاتالونیا، ئەوەی لێهاتوویی تەواوی هەبێت لە بەکارهێنانی مافە مەدەنی و سیاسیەکان، دەتوانێت دەنگ بدات و خۆیشی بپاڵێوێت، بەگوێرەی یاسایی هەڵبژاردنی کاتالونیا، پێویستە پێوەرەکانی یەکسانی

ڕەچاو بکرێت لەنێوان ژنان‌و پیاواندا سەبارەت بە ئامادەکردنی لیستەکانی هەڵبژاردن.

٤- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی، ژن بێت یان پیاو، پازدە ڕۆژ بەر لە کۆتایی هاتنی خولی تەشریعی، بانگەشەی هەڵبژاردن دەکات، لەنێوان چل تا شەست ڕۆژی پاش بانگەشەکە هەڵبژاردنەکان ئەنجام دەدرێت.

**ماددەی ( ٥٧ )**

## پەیڕەوی ناوخۆیی نوێنەران

١- ئەندامانی پەرلەمان لە دەنگدان‌و لە دەربڕینی بیروڕایەکانیان لەکاتی ممارەسەکردنی ئەرکەکانیان لەلایەن یاساوە پارێزراون. لەماوەی نوێنەرایەتی کردنیان، حەسانەیان هەیە، تەنیا لە حاڵەتی تاوانی بینراودا نەبێت، بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان نە تۆمەتبارو نەیش دادگایی دەکرێن.

٢- ئەو کێشانەی کە دژی ئەندامانی پەرلەمان بەرز دەکرێتەوە، لە سەلاحیاتی دادگای باڵای قەزایی کاتالونیایە. ئەندامانی پەرلەمان لە دەرەوەی سنووری کاتالونیا تووشی لێپرسینەوەی تاوانکاری دەبن لەبەردەم دەستەیی جینایی دادگای باڵا.

٣- ئەندامانی پەرلەمان پابەندی خولی پەرلەمانی ئیلزامی نابن.

ماددەی (٥٨)

## سەربەخۆیی پەرلەمان

١- پەرلەمان سەربەخۆیی ئەنجومەنڕاوەیی، دارایی، ئیداری و دیسپلینی هەیە.

٢- پەرلەمان پەیڕەوی ناوخۆیی و بودجەی خۆی ئامادە و پەسەند دەکات و تێیدا سیلکی ئیداری پەرلەمانیش دیاری دەکات.

٣- پەسەندکردن و ریفۆرم کردنی پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان لە دەسەڵاتی پلینێمی پەرلەماندایە و پێویستە بە دەنگی زۆرینەی ڕەهای ئەندامەکانی بێت لە دەنگدانێکی کۆتایی لەسەر تەواوی دەقەکە.

ماددەی (٥٩)

## ڕێکخستنی پەرلەمان و وەزیفەکانی

١- پەرلەمان سەرۆکێکی پیاو یان ژنی دەبێت لەگەڵ دەستەیەکی سەرۆکایەتی لەلایەن پلینۆمەوە هەڵدەبژێردرێن. پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان هەڵبژاردن و وەزیفەکانی پەرلەمان ڕێک دەخات.

٢- پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان، ماف و ئەرکەکانی نوێنەران و مەرجەکانی پێکهاتەی فراکسیۆنە پەرلەمانیەکان و

چۆنیەتی ممارەسەکردنی ئەرکە پەرلەمانییەکان و دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی فراکسیۆنەکان، رێک دەخات.

٣- پەرلەمان بەگوێرەی پلینۆم و لیژنەکانی کاردەکات. فراکسیۆنە پەرلەمانتییەکان بەگوێرەی رێژەی ئەندامەکانیان لە تێکڕایی لیژنەکان بەشداری دەکەن.

٤- پەرلەمان دەستەیەکی هەمیشەیی دەبێت و لەلایەن سەرۆکی پەرلەمانەوە سەرۆکایەتی دەکرێت. ئەو دەستەیە پێک دێت لەو ئەندامانە کە پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمان دیاری دەکات، بەپێی رێژەی نوێنەرایەتی هەر فراکسیۆنێکی پەرلەمانی. دەستەی هەمیشەیی شەونخونی دەکات لەپێناو پەیڕەو کردنی دەسەڵاتەکانی پەرلەمان هەر کاتێ پەرلەمان کۆنەبێتەوە لە خولەکانی نێوان دانیشتنەکان یان کاتێ خولی پەرلەمانی کۆتایی پێ بێت یان هەڵوەشێتەوە. لە حاڵەتی تەواوبوونی خولی تەشریعی یان هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان، ماوەی نوێنەرایەتی ئەندامانی پێکهاتەی دەستەی هەمیشەیی درێژ دەکرێتەوە تا پێکهێنانی پەرلەمانی نوێ.

٥- پێویستە تێکڕای پۆستە گشتییەکانو میلاکی ئیدارە گشتییەکانی کاتالونیا ئەوانەی کە لە سنوورەکانی خاکی کاتالونیاش کاردەکەن، ئامادەبن لەبەردەم پەرلەمان هەر کاتێ داوا بکرێن.

٦- پەرلەمان دەتوانێت لیژنەکانی لێکۆڵینەوە دابمەزرێنێت سەبارەت بە هەر کاروبارێکی دیاری کراوی دەسەڵاتی گشتی کە لە بەرژەوەندی ئەنجوومەنی گشتیدا بێت. پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کە لیژنەکانی لێکۆڵینەوە داوایان دەکات بە ئیجباری ئامادەبن، بەپێی رێوشوێنو ئەو گەرەنتیانە کە پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمان دیاری کردووە. پێویستە سزاکانی جێبەجێ نەکردنی ئەم ئەرکانە بە یاسا رێك بخرێت.

٧- پێویستە پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان رێوشوێنی رواڵەتیو یاسایی رێك بخات سەبارەت بە داواکارییەکانی تاكو جەماعی کە ئاراستەی پەرلەمان دەکرێن، دەبێت میکانزمەکانی بەشداری کردنی هاوڵاتیانیش لەو ئەرکە پەرلەمانیانە دیاری بکرێن.

## ماددەی (٦٠)

## نیزامی کۆبوونەوەکان

١- پەرلەمانی کاتالونیا ساڵانە، بەگوێرەی یەپڕەوی ناوخۆ، لە دوو خولی دانیشتنی ئاسایی کۆدەبێتەوە. دەتوانێت لە دەرەوەی خولەکانی دانیشتنە ئاساییەکان دانیشتنی نا ئاسایی ئەنجام بدات. دانیشتنە نا ئاساییەکانی پەرلەمان لەلایەن سەرۆکی پەرلەمانەوە بانگهێشتە دەکرێن بە ڕەزامەندی دەستەی هەمیشەیی و لەسەر پێشنیاری سێ فراکسیۆنی پەرلەمان یان لەسەر داوای ١/٤ی ئەندامان، یان لەسەر داوای فراکسیۆنە پەرلەمانییەکان یان لەسەر داوای ئەندامانی نوێنەرایەتی زۆرینەی رەها. پەرلەمان دیسان هەر لەسەر داوای سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی بۆ دانیشتنی نا ئاسایی کۆدەبێتەوە. دانیشتنە نا ئاساییەکان لە ڕۆژێکی دیاری کراودا بانگشەی بۆ دەکرێت، بە تەواو بوونی ئەو دانیشتنە کۆتایی پێ دێت.

٢- دانیشتنەکانی پلینۆم بە ئاشکرا دەبێت، تەنیا لەو حاڵەتانە نەبێت کە لەلایەن پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان دیاری کراون.

٣- سەبارەت بە بڕیاردان لەسەر ڕێکەوتنامە بەرکارەکان، پەرلەمان پێویستە بە ئامادەبوونی زۆرینەی ڕەهای نوێنەرانی کۆببێتەوە. ئەو ڕێکەوتنامانە بەرکار دەبن لە حاڵەتی پەسەندکردنیان لەلایەن زۆرینەی ئاسایی ئەندامانی ئامادەبوو، بێ زیان گەیاندن بە زۆرینە تایبەتیەکان کە لە لایەن ئەم یاسایی بنەڕەتی دانراوە، بە گوێرەی یاساکان یان پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان.

**ماددەی ( ٦١ )**

## ئەرکەکان

سەرەڕای ئەو ئەرکانەی کە لە ماددەی (٥٥) دا هاتووە، پەرلەمان ئەم ئەرکانەی خوارەوەی هەیە:

١- دەستنیشانکردنی ئەندامانی پیران کە نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی گشتی دەکەن لە ئەنجوومەنی پیرانی ئیسپانی. پێویستە ئەم دەستنیشانکردنە لە بانگهێشتێکی تایبەتیدا ئەنجام بدرێت بە گوێرەی

ڕێژەی ژمارەی ئەندامانی هەر فراکسیۆنێکی پەرلەمانی.

٢- ئامادەکردنی یاسا پێشنیارکراوەکانو پێشکەش کردنیان بۆ سەرۆکایەتی کۆنگریسی نوێنەرانو لە پاشاندا دەستنیشانکردنی ئەو ئەندامانەی پەرلەمان کە پێویستە لەوێدا داکۆکی لەو پڕۆژە یاسایە بکەن.

٣- داواکردن لە حکومەتی ناوەندی بۆ وەرگرتنی پڕۆژە یاسایەکان.

٤- داواکردن لە دەوڵەت بۆ گواستنەوەی سەلاحیاتەکان یان ڕێپێدان لە چوارچێوەی ماددەی (١٥٠)ی دەستووری ئیسپانی.

٥- ئاراستەکردنی تانەی نا دەستووریەتو ئامادەبوون لە بەردەم دادگای دەستووریی بە گوێرەی ئەحکامەکانی یاسایی ئەساسی دادگای دەستوری.

٦- تێکڕای ئەو ئەرکانە کە ئەم یاسایی بنەڕەتییەو یاساکانی تر پێی دەدەن.

## ماددەی ( ٦٢ )

## دەستپێشخەری تەشریعی و ممارەسەکردنی ئەرکی یاسادانان

١- دەستپێشخەری تەشریعی لەلایەن نوێنەرانو فراکسیۆنە پەرلەمانیەکانو حکومەتەوە دەکرێت. هەروەها هاولاتیانیش بۆیان هەیە پێشنیاری یاسا بکەن لە چوارچێوەی ئەحکامەکانی یاساکانی کاتالونیا، ئۆرگانە نوێنەرایەتیەکانی کیانەکانی شارەوانی دەتوانن ئەو پێشنیارە ئاسایە بکەن.

٢- پلنیۆمی پەرلەمان دەتوانێت، سەبارەت بە رێوشوێنی یاساییو پەسەندکردنی پێشنیاری یاساکان رێ بە لیژنە هەمیشەیەکان بدات کە هەر کاتێ بیەوێ ئەو رێپێدانە بەتاڵ بکاتەوە. ریفۆرمی یاسایی بنەڕەتی، یاساکانی پێشکەوتنی ئەساسی، بودجەی ئەنجوومەنی گشتیو یاساکانی رێپێدانی تەشریعی بە حکومەت نابنە ئامانجی ئەم رێپێدانە.

**ماددەی (٦٣)**

## ڕێپێدان بە حکومەت بۆ ممارسەکردنی دەسەڵاتی تەشریعی

١- پەرلەمان دەتوانێت ڕێ بە حکومەت بدات کە بە ئەرکی دەسەلاتی تەشریعی هەڵبستێت لە دەرکردنی بڕیار کە هێزی یاسایی هەبێت. ئەو بڕیارانەی حکومەت کە پێکهاتووە لە تەشریعی ڕێپێدراو لەژێر ناوی (مەرسوومی تەشریعی) دەردەچێت. ریفۆرمی یاسایی بنەڕەتی، یاساکانی پێشکەوتنی ئەساسی، ڕێکخستنو پەرەپێدانی ڕاستەوخۆی ئەو مافانە کە لەلایەن یاسایی بنەڕەتیەوە دانی پێدانراوە لەگەڵ بەڵێنامەی مافو ئەرکەکانی هاوڵاتیانی کاتالونیاو بودجەی ئەنجوومەنی گشتی نابنە بابەتی ڕێپێدانی تەشریعی.

٢- تەنیا ڕێپێدانی تەشریعی بە حکومەت دەدرێت. پێویستە ڕێپێدانەکە، لەڕێگای یاساوە، بۆ بابەتێکی دیاری کراو بۆ کاتێکی دیاریکراویش بێت. هەر کاتێ حکومەت ئەو مەرسوومە تەشریعیەی بڵاوکردەوە ئەوە ڕێپێدانەکە کۆتایی پێ دێت.

٢- ئەگەر ئەو مەرسوومە یاساییانە کە لە ماوەی سی ڕۆژ پاش دەرکردنیان بێ درێژکردنەوە، بە ئاشکرا لەلایەن پەرلەمانەوە پاش گفتوگۆکردن دەنگ لەسەر تەواوی دەقەکە نەدرێت و تەسدیق نەکرێت ئەوە هەڵدەوەشێنرێتەوە.

٣- پەرلەمان دەتوانێت وەکو پرۆژەی یاسا مامەڵە لەگەڵ ئەو مەرسوومە یاسایانە بکات، کە لە برگەی (٢)ی ئەم ماددەیە هاتووە.

**ماددەی (٦٥)**

## دەرکردنی یاساکان و بڵاوکردنەوەیان

یاساکانی کاتالونیا بەناوی مەلیکەوە لەلایەن سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی دەردەچێت، فەرمانی بڵاوکردنەوەیان دەدات لە "ڕۆژنامەی ئەنجومەنی گشتی کاتالونیا" لەماوەی پازدە ڕۆژدا، هەر لە ڕۆژی پەسندکردنیەوە، هەروەها لە" ڕۆژنامەی فەرمی دەوڵەت"یش بڵاودەکرێتەوە لەو ماوەیەدا. هەر لە کاتی بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەکانی فەرمی کاتالونیا ڕۆژو مێژووی ئەو دەقە دیاری دەکرێت. دەقی فەرمی وەرگێرانەکەی بۆ زمانی ئیسپانی لەلایەن ئەنجوومەنی گشتییەوە دەکرێت.

**ماددەی ( ٦٦ )**

## هۆکارەکانی کۆتایی هاتنی خولی تەشریعی

پەرلەمان (دەسەلاتی تەشریعی-و-) بە تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر ڕۆژی ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان کۆتایی بە خولەکانی دێنێت. دەکرێت پێشوەخت کۆتایی پێ بێت ئەگەر ڕێورەسمی دانانی سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی نەکرێت یان پێشوەخت پەرلەمان حەل بکرێت لەسەر بڕیاری سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی.

**بەشی دووەم**

## سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی کاتالونیا، پیاو بێت یان ژن

**ماددەی ( ٦٧ )**

## هەڵبژاردن و دانانو، میلاکاتو، لادان و دەسەلاتەکانی

١- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی نوێنەرایەتی بالای ئەنجوومەنی گشتی دەکاتو کاروباری حکومەتیش بەڕێوەدەبات. هەروەها نوێنەرایەتی ئاسایی دەوڵەتیش لە کاتالۆنیا دەکات.

٢- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی لەلایەن پەرلەمانەوە لەنێوان ئەندامانی پەرلەمانی کاتالونیا هەڵدەبژێردرێت. دەکرێت ڕێورەسمی هەڵبژاردنی سەرۆک بەیاسا ڕێك بخرێت.

٣- ئەگەر لە حاڵەتێکدا ماوەی دوو هەفتە بەسەرچوو بەسەر یەکەمین دەنگدان بۆ دانانی سەرۆکی ئەنجوومەن، هیچ کاندیدکراوێك هەڵنەبژێردرا، ئەوە پەرلەمان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەڵدەوەشێتەوە سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی یەکسەر بانگهێشتی هەڵبژاردنەکان دەکات کە پێویستە لە نێوان چل‌و هەشت ڕۆژ پاش بانگەشەکە ئەنجام بدرێت.

٤- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی لەلایەن پاشای ئیسپانیاوە دەستنیشان دەکرێت. پێشنیاری ئەو دەستنیشانکردنە لەلایەن سەرۆکی پەرلەمان‌و سەرۆکی حکومەتی ناوەندیەوە تەسدیق دەکرێت.

٥- بەپێی یاسایەکی پەرلەمانی پەیڕەوی میلاکاتی سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی ڕێك دەخرێت. سەبارەت بە پێشینەکان‌و پرۆتۆکۆڵەکان لە کاتالونیا، سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی پێگەی هەمیشەیی هەیەو یەکسەر پاش پاشای ئیسپانی دێت.

٦- وەکو نوێنەری ئاسایی دەوڵەت لە کاتالونیا پێویستە لەسەر سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی ئەمانەی خوارەوە بکات:

أ- دەرکردنی یاساو مەرسوومە یاسایەکان و مەرسوومە تەشریعیەکان لە کاتالونیاو بلاوکردنەوەیان بەناوی پاشای ئیسپانیەوە.

ب- فەرمان دان بە بلاوکردنەوەی ناوی ئەو کەسە کە بۆ پۆستە بالاکانی دەوڵەت لە کاتالونیا دیاری کراوە.

ت- پشتیوانی کردن لەو دەسەلاتانەی دەوڵەت کە لە کاتالونیا ئەرکە گشتییەکانیان ئەنجام دەدەن.

پ- تێکڕای ئەو دەسەلاتانە کە بەپێی یاساکانی تر پێی دەدرێت.

٧- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی لەم حاڵەتانە لادەدرێت: بەهۆی نوێ کردنەوەی پەرلەمان لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان، بەهۆی لێسەندنەوەی متمانە، بەهۆی کۆچ کردنیەوە، یان وازهێنانی یان ناتوانایی هەمیشەیی، جەستەیی بێت یان ئەقلی، ئەویش لەلایەن پەرلەمانەوە تقدیر دەکرێت کە چیدی بۆ ئەو پۆستە ناشێت، یان بەهۆی سزای جینایی سەلمێنراو

کە بڕیاری لێهاتوویی دەدات بۆ ممارەسەنەکردنی وەزیفە گشتییەکان.

٨- ڕاوێژکاری یەکەم، ئەگەر هەبوو، یان ئەو ڕاوێژکارەی کە یاسا دیاری دەکات، جێگای سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی دەگرێتەوە لە حاڵەتەکانی نەبوون، نەخۆشی، لادان بەهۆی نەتوانایی‌و کۆچ کردن. جێگرەوەی سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی لە هیچ حاڵەتێکدا ڕێگای پێ نادرێت ممارەسەی سەلاحیاتی سەرۆکی ئەنجوومەن بکات سەبارەت بە بابەتەکانی پێشنیاری کێشەی لێسەندنەوەی متمانە، دەستنیشان کردن‌و لادانی ڕاوێژکاران‌و هەڵوەشاندنەوەی پێشوەختی پەرلەمان.

٩- سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی، ئەگەر ڕاوێژکاری یەکەم دەست نیشان نەکات، دەتوانێت بەشێوەیەکی کاتی ئەرکەکانی دەسەلاتی جێبەجێکردن بە یەکێك لە ڕاوێژکارانی بسپێرێت.

# بەشی سێهەم
# حکومەتو ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی
## لقی یەکەم
## حکومەت

**ماددەی ( ٦٨ )**

### ئەرکەکانو پێکهاتەی حکومەتو ڕێکخستنو لادان

١- حکومەت ئۆرگانی باڵایەو کاروباری سیاسیو ئیداری ئەنجوومەنی گشتی بەڕێوە دەباتو ممارەسەی ئەرکی جێبەجێکردنو دەسەڵاتی تەشریعی دەکات بەپێی ئەم یاسا بنەڕەتییەو یاساکانی تر.

٢- حکومەت پێك دێت لە سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتیو ڕاوێژکاری یەکەم، ئەگەر هەبێت، لەگەڵ تەواوی ڕاوێژکارەکان (وەزیرەکان ـو ـ ...).

٣- بەپێی یاسایەك، کاروباری ڕێکخستنو ئەركو سەلاحیاتی حکومەت ڕێك دەخرێت.

٤- کارو بنەما گشتییەکانو ئەو فەرمانانە کە حکومەتی ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی دەری دەکات پێویستە لە "ڕۆژنامەی فەرمی ئەنجوومەنی گشتی" بڵاوبکرێتەوە. بەم بڵاوکردنەوەیە تێکڕایی ئەو کارە یاسایانە دەخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

**ماددەی ( ٦٩ )**

## راوێژکاری یەکەم، پیاو بێت یان ژن

سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی بەپێی مەرسووم دەتوانێت راوێژکاری یەکەم دەستنیشان بکاتو لابدات. پێویستە لەم کارانەدا پەرلەمان ئاگادار بکاتەوە. راوێژکاری یەکەم ئەندامی حکوومەتە، بەپێی یاسا ئەرکی تایبەتمەندی هەیە، سەرەڕای ئەوانەی کە لەلایەن سەرۆکەوە ڕێی پێدراوە.

**ماددەی ( ٧٠ )**

## پەیڕەوی ناوخۆیی میلاکی ئەندامانی حکومەت

١- ئەنجوومەنی گشتیو راوێژکاران، لەماوەی خولی فەرمانڕەوایەتیان، نە دەستگیر دەکرێنو نەیش بەند دەکرێن بەهۆی تۆمەتبار کردنیان بە تاوانی جینائی لە سنووری خاکی کاتالونیا، مەگەر لە حاڵەتی تاوانی بینراودا بێت.

٢- ئەرکی دادگای باڵای قەزایی کاتالونیایە بڕیار بدات سەبارەت بە بێتاوانیو رێورەسمی دادگایی کردنیان. لە دەرەوەی سنووری خاکی کاتالونیا دووچاری بەرپرسیارێتی جینائی دەبن لەبەردەم دەستەی جینائی دادگای باڵا.

## لقی دووەم
## ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی

**ماددەی ( ٧١ )**

**بنەما گشتییەکان، پرنسیپەکان، کاروباری ڕێکخستنو وەزیفەکانی.**

١- ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی ئەو دامەزراوەیە کە ممارەسەی ئەرکەکانی جێبەجێکردن دەکات کە لەلایەن ئەم یاسایی بنەڕەتیەوە پێی دراوە.

٢-ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی بەشێوەیەکی بابەتیانە خزمەتی بەرژەوەندییە گشتییەکان دەکاتو پابەندی تەواوی یاساکانو ڕێنمایەکان دەبێت.

٣- ئیدارەی ئەنجومەنی گشتی بەگوێرەی پرنسیپەکان هەماهەنگیو شەفافیەت کار بۆ زامن کردنی پێکهاتەی سیاسەتە گشتیەکانی دەکات.

٤- ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی، بەگوێرەی پرنسیپەکانی شەفافیەت، پێویستە زانیاری دروست بڵاوبکاتەوە تا هاوڵاتیان بتوانن کارەکانی بنرخێنن.

٥- ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی لە سنووری خاکی کاتالونیا بەپێی پرنسیپەکانی لامەرکەزیەتو کۆنەکردنەوەی دەسەڵاتەکان مارەسەی ئەرکەکانی دەکات.

٦- پێویستە یاساکان باری رێکخستنی ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی رێك بخاتو لە هەموو حاڵەتێکدا پێویستە ئەم کارانەی خوارەوە دیاری بکات:

أ- جۆرەکانی لامەرکەزیەتی وەزیفەیی‌و شێوە جیاجیاکانی تەشخیصی گشتی‌و تایبەتی کە دەکرێت ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی تەبەنای بکات.

ب- شێوەکانی رێکخستن‌و ئیدارەی خزمەتگوزاریە گشتییەکان.

ت- کاری ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی لەژێر رۆشنایی نیزامی یاسایی تایبەت دەکرێت، هەروەها بەشداری کردنی کەرتی تایبەت لە راپەڕاندنی سیاسەتە گشتییەکان‌و پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریە گشتییەکان.

٧- پێویستە پەیرەوی یاسایی میلاکاتی ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی بەیاسا رێك بخرێت. لە هەموو حاڵەتەکاندا، نیزامی کۆنەکردنەوە زیاتر لە وەزیفەیەك‌و گەرەنتی پێکهێنان‌و بە

سەردەمیانەکردنی زانیاریەکان زۆر پێویستن بۆ
ممارەسەکردنی وەزیفەکان.

ماددەی ( ٧٢ )

## ئۆرگانە راوێژکارەکانی حکومەت

١- لیژنەی راوێژکاری یاسایی ئۆرگانی راوێژکردنی حکومەتە، بەپێی یاسایەکی پەرلەمان پێکهاتەو وەزیفەکانی ڕێك دەخرێت.

٢- ئەنجوومەنی کارو ئابووری‌و کۆمەڵایەتی کاتالونیا ئۆرگانی راوێژکاری حکومەتە لە بوارەکانی سوسیو ئابووری‌و کارگەلی پیشەیی. بەپێی یاسایەکی پەرلەمان پێکهاتەو وەزیفەکانی ڕێك دەخات.

# بەشی چوارەم
# پەیوەندییەکانی نێوان پەرلەمان و حکومەت

## ماددەی (٧٣)

## ماف و ئەرکەکانی ئەندامانی حکومەت بەرامبەر بە پەرلەمان

١- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی و راوێژکارەکانی مافیان هەیە ئامادەی کۆبوونەوەکانی پلینۆم و لیژنە پەرلەمانییەکان ببەن و مافی قسەکردنیشیان هەبێت.

٢- پەرلەمان دەتوانێت لە حکومەت و ئەندامانی داوای زانیاری پێویست بکات سەبارەت بە ممارەسەکردنی ئەرکەکانیان. دەتوانێت داوای ئامادەبوونیان بکات لە دانیشتنی پلینۆم و لیژنەکان، بەو شێوەیەی کە پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان دایناوە.

## ماددەی (٧٤)

## بەرپرسیاێتی سیاسی حکومەت و ئەندامەکانی

١- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی و راوێژکارەکانی لەلایەنی سیاسیەوە بەرپرسیارن لەبەردەم پەرلەمان بەشێوەی

هاوکاری کردن، بێ زیان گەیاندن بە بەرپرسیاریتی ڕاستەوخۆی هەر یەکە لەوانە.

٢- ڕێپێدانی وەزیفەکانی سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی، قورتاری ناکات لە بەرپرسیاریتی سیاسی لەبەردەم پەرلەمان.

ماددەی (٧٥)

## هەڵوەشاندنەوەی پێشوەختی پەرلەمان

سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی، پاش گفتوگۆکردنی پێشوەخت لەگەڵ حکومەت و لەسەر بەرپرسیاریتی تایبەتی خۆی، دەتوانێت پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوە. ئەم دەسەلاتە نابێت ممارەسە بکرێت هەر کاتێ بابەتی لێسەندنەوەی متمانە لە ئارادا بێت، یان ئەگەر ساڵێك بەلانی کەمەوە بەسەر دواترین هەڵوەشاندنەوە تێنەپەڕیبووبێت. پێویستە لەگەڵ مەرسوومی هەڵوەشاندنەوەکە، بانگەشە بۆ هەڵبژاردنی نوێ بکات، کە دەبێت لە نێوان چل تا شەست ڕۆژی پاش بڵاوکردنەوەی مەرسوومەکە لە (ڕۆژنامەی فەرمی کاتالونیا) ئەنجام بدرێت.

# بەشی پێنجەم
# دامەزراوەکانی ئەنجوومەنی گشتی
## لقی یەکەم
## ئەنجوومەنی زمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی

**ماددەی ( ٧٦ )**

**وەزیفەکان**

١- ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی دامەزراوەیەکی ئەنجوومەنی گشتییەکە شەونخونی دەکات لەپێناو تەکیف (گونجاندن) بنەما گشتییەکانی ئەنجوومەنی گشتی لەگەڵ ئەم یاسای بنەڕەتی‌و دەستووری ئیسپانی لە چوارچێوەی ئەحکامەکانی برگەی دووەمدا.

٢- ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی دەتوانێت لە چوارچێوەی یاسادا، لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا رای خۆی بدات:

أ- تەکیف کردنی پرۆژەو پێشنیارەکانی ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی ئۆتۆنۆمی کاتالونیا بەر لە پەسندکردنی لە پەرلەمان، لەگەڵ دەستووری ئیسپانی.

ب- تەکیف کردنی ئەو پرۆژەو پێشنیارانەی یاسا کە خراوەتە گفتوگۆوەو پەسندکردنی لە پەرلەمان

هەروەها ئەو مەرسوومە یاسایانە کە خراوەتە بەر دەستی پەرلەمان، لەگەڵ ئەم یاسای بنەڕەتی‌و دەستووری ئیسپانی.

ب- تەکیف کردنی ئەو پرۆژە مەرسوومە تەشریعانە کە لەلایەن حکومەتەوە پەسندکراون لەگەڵ ئەم یاسای بنەڕەتی‌و دەستووری ئیسپانیدا.

ج- تەکیف کردنی ئەو پرۆژەو پێشنیارانەی یاساو پرۆژە مەرسوومە تەشریعانە کە لەلایەن حکومەتەوە پەسندکراون لەگەڵ ئۆتۆنۆمی ناوچەیی لە چوارچێوەی ئەم یاسای بنەڕەتییەدا.

٢- ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی پێویستە رای خۆی بدات بەر لە ئاراستەکردنی تانەی نا دەستووریەت لەلایەن پەرلەمان یان حکوومەت، یان بەر لە ئاراستەکردنی تانەی ناکۆکی سەلاحیات لەلایەن حکومەت‌و بەر لە تانەی ناکۆکی لەپێناو داکۆکی کردن لە ئۆتۆنۆمی ناوچەیی لەبەردەم دادگای دەستووری.

٣- بڕیارەکانی ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی سیفەتی پەیوەندیداری هەیە سەبارەت بە پرۆژەکانی یاساو پێشنیارەکانی یاسایی پەرلەمان کە پەرە یان زیان

بەو مافانە دەگەیەنێت کە لەلایەن ئەم یاسایی بنەڕەتیە، پارێزراون.

**ماددەی ( ٧٧ )**

## پێکهاتەو چۆنیەتی راپەڕاندنی وەزیفەکانی ئەنجوومەنی زەمانەتەکان

١- ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی پێك دێت لەو ئەندامانە کە لەلایەن سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی، لەنێوان یاساناسانی خاوەن ئەزموون دەستنیشان دەکرێن! ٢/٣ی لەسەر پێشنیاری پەرلەمان و، بە زۆرینەی ١/٥ی نوێنەران و لەسەر پێشنیاری حکومەت.

٢- پێویستە ئەندامانی ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی لە نێوان خۆیاندا سەرۆکێك هەڵبژێرن.

٣- بەپێی یاسایەکی پەرلەمان پێکهاتەو چۆنیەتی راپەڕاندنی وەزیفەکان و پەیڕەوی ناوخۆیی ئەندامانی رێك دەخرێت. دەکرێت بەپێی یاسا ئەرکەکانی فراوانتر بکرێت.

٤- ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی بەپێی یاسا سەربەخۆیی ئۆرگانی و ئیداری و دارایی هەیە.

# بەشی دووەم
# سەندیکای دادوەری

ماددەی ( ٧٨ )

## وەزیفەو پەیوەندیەکانی لەگەڵ دامەزراوە هاوبەشیەکان

١- ئەرکی سەندیکای دادوەری پاراستن‌و پارێزگارکردنی ئەو ماف‌و ئازادیانەیە کە لەلایەن دەستوورو یاسای بنەڕەتیەوە پارێزراون. هەر بەو مەبەستە بەشێوەیەکی تایبەتی چاودێری چالاکی ئیدارەی گشتی ئەنجوومەنی گشتی‌و چالاکی ئۆرگانیزمە گشتییەکان‌و کۆمپانیا تایبەتیەکانی خزمەتگوزاری گشتی دەکات. هەر بەهەمان شێوە چاودێری ئیدارەی ناوچەیی کاتالونیاو چالاکی ئۆرگانیزمە گشتی یان تایبەتیەکانی دەکات.

٢- سەندیکای دادوەریی دەتوانێت داوای ڕای ئەنجوومەنی زەمانەتەکانی یاسای بنەڕەتی بکات سەبارەت بە پرۆژەو پێشنیارەکانی ئەو یاسایانە کە خراونەتە بەر گفتوگۆ بۆ پەسندکردنیان لە پەرلەمان، هەروەها مەرسوومە یاسایەکانیش.

٣- سەندیکای دادوەریی دەتوانێت پەیوەندیەکانی هاوکاری ببەستێت لەگەڵ داکۆکیکەرانی ناوچەیی هاوڵاتیبوون‌و

فیگەرە هاوشێوەکانی دی کە لە بواری گشتیو تایبەتی دامەزراون.

٤- پێویستە لەسەر ئیدارە گشتییەکانی کاتالونیاو تێکڕای کیانەکانی دیو ئەو کەسانەی کە پەرەگرافی یەکەم ئاماژەیان پێ دەکات، هاوکاری سەندیکای دادوەری بکەن. پێویستە سزاکانو ئەو میکانیزمانە کە تەرخان کراون بۆ مسۆگەرکردنی جێبەجێکردنی ئەم ئیلتزامە بەپێی یاسا رێك بخرێت.

**ماددەی ( ٧٩ )**

## دامەزراندنی سەندیکای دادوەریی و پەیڕەوی ناوخۆیی

١- سەندیکای دادوەریی بە زۆرینەی ٣/٥ی ئەندامەکانی لەلایەن پەرلەمانەوە هەڵبژێراون.

٢- سەندیکای دادوەریی بەبێ لایەنیو سەربەخۆیی ممارەسەی وەزیفەکانی دەکات، لە دەربڕینی بیروڕاکانیان لەکاتی ممارەسەکردنی ئەرکەکانیان پارێزراون، ئەندامانی سەندیکای دادوەریی لانابرێن مەگەر لەو حاڵەتانە بێت کە یاسا رێی پێداوە.

٣- پێویستە لە پەیڕەوی ناوخۆیی سەندیکای دادوەریدا، رەچاوی پرنسیپەکانی کۆنەکردنەوەی زیاتر لە وەزیفەیەك،

هۆیەکانی لابردن، کاروباری ڕێکخستن‌و ئەرکەکانی دامەزراوەکە بکرێت‌و بە یاسا ڕێك بخرێت. سەندیکای دادوەری سەربەخۆیی تەشریعی، ڕێکخراوەیی، ئیداری‌و دارایی بەپێی یاساکان هەیە.

## لقی سێیەم

**ماددەی (٨٠)**

## دیوانی چاودێری دارایی‌و دادگای چاودێری دارایی

١- دیوانی چاودێری دارایی ئۆرگانی چاودێری کردنی دارایی‌و ئیداری‌و ئابووری‌و کۆنترۆل کردنی توانایی ئەنجومەنی گشتی‌و کیانە ناوچەیی‌و تێکڕای کەرتی گشتی کاتالونیایە.

٢- دیوانی چاودێری دارایی ئۆرگانێکی پەرلەمانە، لە ڕێگای ڕێپێدانی پەرلەمانەوە، ممارەسەی ئەرکەکانی دەکات، سەربەخۆیی ڕێکخراوەیی‌و ئیداری‌و دارایی بەگوێرەی یاسا هەیە.

٣- پێویستە دیوانی دارایی‌و دادگای چاودێری دارایی پەیوەندییەکانی هاوکاری لەڕێگای ڕێکەوتنامە ساز بدات. دەبێت لەو ڕێکەوتنامانە میکانزمەکانی بەشداری کردنی لە ئیجرائاتی قەزایی دابنرێت بە

تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بە بەرپرسیارێتی داراییەوە هەیە.

**ماددەی ( ٨١ )**

## پێکهاتەی دیوانی چاودێری دارایی، شێوەی جێبەجێکردنی کارەکانی، پەیڕەوی ناوخۆیی و میکانیزمەکانی

١- دیوانی چاودێری دارایی پێك دێت لەو کەسانە کە لەلایەن پەرلەمانەوە بە زۆرینەی ٣/٥ی ئەندامانی دادەنرێن. ئەندامەکانی لەنێوان خۆیاندا ئەندامێکی بەتەمەنی وەکو سەرۆك هەڵدەبژێرن.

٢- پێویستە لە پەیڕەوی ناوخۆی میلاکاتیان ڕەچاوی پرنسیپی کۆنەکردنەوەی زیاتر لە وەزیفەیەكو هۆیەکانی لادانو کاروباری ڕێکخستنو ئیداری دیوانی دارایی بکاتو بە یاسا ڕێکی بخات.

**لقی چوارەم**

## ڕێکخستنی ئەنجوومەنی هۆیەکانی بیستراو بینراو

**ماددەی ( ٨٢ )**

ئەنجوومەنی هۆیەکانی بیستراو بینراوی کاتالونیا دەسەڵاتی ڕێکخەریی سەربەخۆیی لەبواری گەیاندنی بیستراو بینراوی حکومیو ئەهلی هەیە. ئەو ئەنجوومەنە سەربەخۆیەکی

تەواوی هەیە لە حکومەتی ئەنجوومەنی گشتی بۆ مەمارەسەکردنی ئەرکەکانی. پێویستە یاسایەکی پەرلەمان پێوەرەکانی هەڵبژاردنی ئەندامەکانیو بواری تایبەتمەندێتی کارەکان رێك بخات.،

## بەشی پێنجەم

## لقی یەکەم

**ماددەی ( ٨٣ )**

### کاروباری رێکخستنی حکومەتی ناوچەیی لە کاتالونیا

١- کاروباری رێکخستنی هەرێمایەتی سەرەکی کاتالونیا پێك هاتووە لە شارەوانیو حاکمیەکان.

٢- تێکڕای دەستە شارەوانییەکانی تر ئەنجوومی گشتی دروستی دەکات لەسەر ویستی هاوکاریو یەکگرتنی شارەوانیەکان.

**ماددەی ( ٨٤ )**

### دەسەڵاتە ناوچەییەکان ( خۆجێیەکان. و. )

١) ئەم "یاسای بنەڕەتی"یە کۆمەڵێك سەلاحیاتی تایبەتمەندی بۆ شارەوانیەکان مسۆگەر کردووە کە پێویستە لەلایەن کیانەکانەوە مەمارەسە بکرێت بە

سەربەخۆیەکی تەواو، تەنیا پابەندی کۆنترۆڵی دەستووریەتو شەرعیەت دەبێت.

٢) حکومەتە خۆجێیەکانی کاتالونیا لە هەموو حاڵەتێکدا سەلاّحیاتی تایبەتمەندیان لەم بابەتانەی خوارەوە هەیە:

١. رێکخستنو ئیدارە، پلانی شارستانیو دەیسپلنی ئاوەدانکردنەوەو پاراستنو راگرتنو مانەوەی کەلوپەلەکانی کەرتی گشتی خۆجێیەتی.

٢. پلان رێژیو دانانی پرۆگرامو ئیدارەی نشینگە گشتییەکانو بەشداری کردن لە پلانی دارشتن بۆ زەوییەکانی شارەوانی بۆ نیشتەجێبوون.

٣. کاروباری رێکخستنو پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریە سەرەکیەکان بۆ کۆمەڵگاکانی کاتالونیا.

٤. رێکخستنو بەرێوەبردنی تیمەکانی شارەوانی.

٥. رێکخستنی باری ئاسایشو تەندروستی لە شوێنە گشتییەکان.

٦. بەرگری مەدەنیو خۆپاراستنی لە ئاگر کەوتنەوە.

٧. پلان دارشتنو ئیدارەکردنی پەروەردەیی منداڵانو بەشداری کردن لە پرۆسەی تۆمارکردن لە سەنتەرە گشتییەکانو گرێ بەستەکان لە چوارچێوەی شارەوانیەکاندا.

٨. هاتووچۆو ڕێکخستنی خزمەتگوزاریەکانی گواستنەوە بۆ ڕێبوارانی شارەوانی.

٩. ڕێکخستنی دامودەزگاکانی وەرگرتنو (ترخیصات)و پشتگیری کردنی هەموو جۆرە چالاکیەکانی ئابووری، بەتایبەتی ئەوانەی بواری بازرگانیو پیشەییو گەشتوگوزار.

١٠. ئیدارەکردنی سیاسەتەکانی پاراستنی ژینگەو پێشکەوتنی سەقامگیری.

١١. ڕێکخستنو ئیدارەکردنی تیپەکانی وەرزشو ئارەزومەندانو پشتگیریکردنی چالاکیەکانیان.

١٢. ڕێکخستنی دامەزراوەکانی ژێرخانی پەیوەندیەکانی تەلو بێتەل.

١٣. پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریەکانی چاودێری کەسەکانو خزمەتگوزاریەکانی کۆمەڵایەتیو کۆمەکی گشتیو پشتگیری کردنی سیاسەتەکانی بواری کۆچبەران.

١٤. ڕێکخستنو ئیدارەکردنی چالاکیو کارەکانی سەر بلاژو لێوارو ڕووبارو دەریاچەو چیاکان.

٣) دابەشکردنی بەرپرسیارێتی ئیداری سەبارەت بەو بابەتانە کە لە برگەی (٢) ئاماژەی پێ کراوە لەنێوان ئیدارە ناوچەیە جیاجیاکان. پێویستە رەچاوی توانایی ئیدارەکردنیان بکرێتو بە یاسا رێك بخرێت لەلایەن پەرلەمانەوە بەگوێرەی پرنسیپو دەقەکانی بەڵێنامەی ئەورووپی بۆ ئۆتۆنۆمی خۆجێییتی.

٤) پێویستە ئەنجوومەنی گشتی میکانزمەکانی خۆی دیاری بکات بۆ کۆمەك کردنی ئەو خزمەتگوزارییە نوێیانە کە لە ئاکامی بەرفراوان بوونی دەسەڵاتی حکومەتە خۆجێیەکان دێتە ئاراوە.

**ماددەی ( ٨٥ )**

## ئەنجوومەنی حکومەتە خۆجێیەکان

ئەنجوومەنی حکومەتە خۆجێیەکان ئۆرگانی نوێنەرایەتی شارەوانیو حاکمیەکانە لەنێو دامەزراوەکانی ئەنجوومەنی گشتی. پێویستە پرس بە ئەنجوومەن بکرێت سەبارەت بەو رێوشوێنانەی پەرلەمان کە دەیکات بۆ ئارەستەکردنی ئەو پێشنیارانەی تەشریعی کە بە شێوەیەکی تایبەتی کار لە ئیدارەکانی خۆجێبەتی دەکات. بەپێی

یاسایەکی پەرلەمان پێکهاتەو کاروباری ڕێکخستن‌و ئەرکەکانی حکومەتە خۆجێییەکان ڕێك دەخات.

## لقی دووەم
## شارەوانی

**ماددەی ( ٨٦ )**

**شارەوانی‌و سەربەخۆیی شارەوانی**

١- شــارەوانی کیــانێکی خۆجێیــەتی ســەرەکیە لــە ڕێکخستنی ئیداری کاتالونیـاو هۆکـارێکی جەوهەریـشە بۆ بەشداری کردنی کۆمەڵگای خۆجێیەتی لە کاروبـارە گشتییەکان.

٢- حکومەت‌و ئیدارەکانی شارەوانی پێك دێت لە عومـدەو ئەنـدامانی شـارەوانی. پێویـستە مەرجـەکانی بوونیـان بەیاسا ڕێك بخرێت.

٣- ئەم "یاسـای بنەڕەتییـە" سـەربەخۆیی بـۆ شـارەوانی زامن دەکات بۆ ممارەسەکردنی سەلاحیاتەکان لەپێناو بـەرگری کـردن لـە بەرژەوەندیـە تایبەتیـەکانی ئـەم کۆمەڵگایە کە نوێنەرایەتی دەکات.

٤- نابێت ئەو کاروبارو رێکەوتنامانەی کە شارەوانیەکان ئەنجامی دەدەن بخرێنە ژێر کۆنترۆڵی هیچ ئیدارەیەکی ترەوە.

٥- ئەنجوومەنی گشتی کۆنترۆڵی کاروبارو رێکەوتنامەکانی شارەوانیەکان دەکات بەگوێرەی رێوشوێنی یاسایی بێ زیان گەیاندن بە ئەرک و کارەکانی دەوڵەت.

٦- ئەندامانی شارەوانی لەلایەن دانیشتوانی شارەوانیەکانەوە هەڵبژێراون لەرێگای دەنگدانێکی گشتی، یەکسان، ئازادو راستەوخۆو نهێنی.

٧- ئەو کۆمەڵگانەی دانیشتوان کە لەنێو یەك شارەوانیدا دەژین و لە یەکەی جیاجیادا دەتوانن کیانێکی شارەوانی لامەرکەزی پێك بهێنن. پێویستە بەیاسا لامەرکەزیەت و لێهاتوویان رێك بخرێت.

**ماددەی ( ٨٧ )**

## پرنسیپەکانی ڕێکخستن و جێبەجێکردن و دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی

١- شارەوانیەکان لێهاتوویی تەواویان هەیە بۆ خۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردن لە چوارچێوەی ئەو بنەما گشتیانە کە بەپێی یاسا دانراون لەبواری ڕێکخستن و راپەڕاندنی کاروبارەکانی شارەوانی.

٢- شارەوانیەکان مافی ئەوەیان هەیە لەگەڵ شارەوانیەکانی دی یەکبگرن و هاوکاری بکەن لەگەڵ کیانە گشتییەکانی تردا بۆ ممارەسەکردنی دەسەڵاتەکانیان و کاروباری بەرژەوەندی هاوبەش. هەر لەم ڕوانگەوە دەتوانن ڕێکەوتن ئەنجام بدەن و بەشداری بکەن لە کۆمەڵەو گروپ و پەیوەستەکان، هەروەها دەتوانن چالاکی هاوشێوەی تری هاوبەش ئەنجام بدەن. ناتوانرێت بەپێی یاسا ئەم مافە سنووردار بکرێت، مەگەر بۆ مسۆگەرکردنی سەربەخۆیی ئەو کیانانە بێت کە مافەکانیان پارێزراوە.

٣- شارەوانیەکان دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتیان هەیە، بۆ گوزارشت کردن لە پرنسیپی دیموکراسی کە لە سەری بناغەنراون، لە بواری دەسەڵاتەکانیانو ئەو دەسەڵاتانەی دی کە ئۆتۆنۆمیەکەیان پێیانی داوە.

**ماددەی ( ٨٨ )**

## پرنسیپی جیاکاری

پێویستە ئەو یاسایانەی کە تەرخان کراون بۆ نیزامی یاسایی، ئۆرگانی، ئیداری، سەلاحیاتو دارایی شارەوانیەکان خەسڵەتە جیاجیاکانی دیموگرافی، جوگرافی، ئیداری، رێکخراوەیی لەبەر چاو بگرن بەو قەوارەو توانایی ئیدارەیە کە لەبەر دەستیان دایە.

**ماددەی ( ٨٩ )**

## نیزامی تایبەتمەندی شارەوانی بەرشەلۆنە

شارەوانی بەرشلۆنە نیزامێکی تایبەتمەندی هەیە بەپێی یاسای پەرلەمان دانراوە. شارەوانی بەرشلۆنە مافی دەستپێشخەری هەیە سەبارەت بە پێشنیارکردنی ریفۆرمو دەستکاری لەو نیزامە تایبەتمەندە. بە گوێرەی یاساکانو پەیڕەوی ناوخۆیی پەرلەمان، پێویستە بەشداری بکات لە ئامادەکردنی پرۆژەکانی یاسا.

# لقی سێهەم
# حاکمیەکان

ماددەی (٩٠)

## حاکمییە

١- حاکمیە ئەو هەرێمە تایبەتمەندییەیە بۆ ممارەسەکردنی ئیدارەی نێوان شارەوانیەکان سەبارەت بە هاوکاری کردنی ناوچەیی کەسایەتی یاسایی تایبەتمەندی هەیە. ئەم حاکمییانە بۆ چەند ناوچەیەکی هەرێمایەتی دابەش کراوە لەلایەن ئەنجومەنی گشتی بۆ رێکخستنی کاروباری هەرێمەکان و پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکان.

٢- حاکمیە، وەکو حکومەتی خۆجێیەتی، سیفەتێکی هەرێمایەتی هەیەو سەربەخۆشە لە ئیدارەکردنی بەرژەوەندییەکانی.

ماددەی (٩١)

## ئەنجوونی حاکمیەکان

١- حکومەتو ئیدارەی سەربەخۆیی حاکمیەت تایبەتە بە ئەنجوومەنی حاکمیەت، کە پێک هاتووە لە سەرۆکو راوێژکاری حاکمیەت.

٢- سەرۆکی حاکمیەت لەلایەن راوێژکارانی حاکمیەتەوە لەنێوان ئەندامەکانیدا هەڵدەبژێردرێت.

٣- ئەنجوومەنەکانی حاکمیەت جێگای دەستەی نوێنەرایەتی دەگرنەوە، پێکهێنان و هەموارکردن و هەڵوەشاندنەوەو دانانی نیزامی یاسایی حاکمیەکان بەپێی یاسایی پەرلەمان رێك دەخرێت.

## لقی چوارەم

### ماددەی (٩٢)

### ناوچە

١- ناوچە کیانێکی خۆجێیەتیەو کەسایەتی یاسایی تایبەتمەندی هەیەو پێك دێت لە هەندێ شارەوانی بۆ ئەنجامدانی سەلاحیات و خزمەتگوزاریە خۆجێیەتیەکان.

٢- پێکهێنان و هەموارکردن و هەڵوەشاندنەوەی ناوچەکان و دانانی نیزامی یاسای ئەم کیانانە، بەپێی یاسای پەرلەمان رێك دەخرێت.

ماددەی ( ٩٣ )

## کیانە خۆجێیەتیەکانی شارەوانیەکان تر

کیانە خۆجێیەتیەکانی شارەوانیەکان لەسەر ئیرادەی هاوکاریو یەکگرتنی. شارەوانیەکان دادەنرێن بەپێی یاسا بارێزراون. کاروباری بەڕێوەبردنو ئیدارییان بەپێی یاسای پەرلەمان رێك دەخرێت.

## بەشی حەوتەم

## کاروباری رێکخستنی دامەزراوەیی تایبەتمەندی دۆڵی ئاران

ماددەی ( ٩٤ )

### نیزامی یاسایی

١- دۆڵی ئاران نیزامێکی یاسایی تایبەتمەندی هەیەو بەپێی یاسایەکی پەرلەمان دانراوە. لەڕێگای ئەم نیزامەوە ئیعتراف بە تایبەتمەندێتی رێکخستنی دامەزراوەییو ئیدارەی دۆڵی ئاران دەکرێتو ئۆتۆنۆمی بۆ زامن دەکرێت بۆ رێکخستنی کاروباری ئیدارییو بەڕێوەبردنی ناوچەکە.

٢- دامودەزگاکانی حکومەتی "دۆڵی ئاران" پێک دێت لە ئەنجومەنێکی گشتیو ئەندامەکانی. فەرمانڕەوایەتی دۆڵی ئاران بالاترین نوێنەرایەتی ئەنجومەنی گشتی دۆڵی ئارانە.

٣- دامەزراندنی حکومەتی دۆڵی ئاران لەڕێگای دەنگدانی گشتی، یەکسانی، ئازادو راستەوخۆو نهێنی هەڵبژێراو بەپێی یاسا دەبێت.

٤- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لەو بابەتانە کە بەپێی یاسا لە نیزامی تایبەتمەندێتی دۆڵی ئاران هاتووە، لەگەڵ تێکڕایی ئەو یاسایانە کە لەلایەن پەرلەمانەوە پەسندکراون.

٥- بەپێی یاسایەکی پەرلەمان سەرچاوەی دارایی ئەم دۆڵە دابین دەکرێت، تا ئەنجوومەنی گشتی دۆڵی ئاران بتوانێت خزمەتگوزاریەکان لەناوچەی دەستەڵاتی خۆی پێشکەش بکات.

## دەروازەی سێهەم

## دەربارەی دەسەڵاتی قەزایی لە کاتالونیا

## بەشی یەکەم

## دادگای باڵای قەزاو داواکاری گشتی کاتالونیا

**ماددەی (٩٥)**

**دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا**

١- دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا لوتکەی ئۆرگانی قەزاییە لە کاتالونیاو پسپۆڕایەتی لەو چوارچێوەیەدا دەبێت کە یاسایی ئەساسی بۆی دیاری کردووە. لە هەموو حاڵەتێکدا، دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا پسپۆڕایەتی هەیە لە قەزای مەدەنی، جینایی، ناکۆکی- ئیداری، کۆمەڵایەتیو بازرگانیو لەو بوارانەدا کە لە ئاییندەدا بۆی دادەنرێت.

٢- ئەو رێوشوێنە قەزاییانە کە لە کاتالونیا بەڕێوەدەچێت بەرپرسیارێتی یاساییان هەیە لەبەردەم دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا.

٣- لە تایبەتمەندییەکانی دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا یەکبوونی لێکدانەوەی یاسایی لە کاتالونیا، هەروەها ئەرکی تانە لێدانە لە یابەتی یاساکانی حکومەتی ناوەند، تەنیا ئەو اختصاصانە نەبێت کە دراونەتە دادگای باڵا بۆ یەکبوونی بنەماکانی.

٤- لە اختصاصاتی دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا چارەسەرکردنی توانجە نا ئاسایەکانی پێداچوونەوەیە کە ڕێگا بە یاسا دەدات دژی ئەو بڕیارانە کە لەلایەن ئۆرگانە قەزاییەکانی کاتالونیا دراون.

٥- سەرۆکی دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا نوێنەری دەسەڵاتی قەزاییە لە کاتالونیا. لەلایەن پادشاوە دەستنیشان دەکرێت، لەسەر پێشنیاری ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی، لەنێوان ئەو یاساناسانە کە لەلایەن ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیاوە پێشکەش کراون، پێویستە دادوەری بە ئەزموون بن و بەلانی کەمەوە (١٥) ساڵ لەبواری یاسادا کاریان کردبێت و (٥) پێنج ساڵیشی لە کاتالونیا بووبێت. سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی پاش دامەزراندنی سەرۆکی دادگا فەرمان دەدات لە "ڕۆژنامەی فەرمی ئەنجوومەنی گشتی" لە کاتالونیا فەرمانەکە بڵاوبکرێتەوە.

٦- سەرۆکەکانی دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا لەسەر پێشنیاری ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی دادەمەزرێن، لەڕێگای ئەو لیستەوە کە لەلایەن ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا پێشکەش دەکرێن.

ماددەی ( ٩٦ )

## داواکاری گشتی کاتالونیا

١- داواکاری گشتی کاتالونیا سەرۆکی باڵای قەزاییە لە کاتالونیاو نوێنەری داواکاری گشتی ئیسپانیایە لە کاتالونیا.

٢- داواکاری باڵای کاتالونیا لەلایەن حکومەتی ناوەندیەوە دادەنرێت لەسەر پێشنیاری حکوومەتی کاتالونیا.

٣- سەرۆکی ئەنجوومەنی گشتی پاش دامەزراندنی داواکاری گشتی کاتالونیا فەرمان دەدات لە "ڕۆژنامەی فەرمی ئەنجوومەنی گشتی" فەرمانەکە بڵاوبکرێتەوە.

٤- داواکاری باڵای کاتالونیا پێویستە دانەیەك لە یاداشتی ساڵانەی داواکاری دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا ڕەوانەی حکومەتو ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیاو پەرلەمان بکات.

٥- ئەرکەکانی داواکاری باڵای کاتالونیا هەمان پەیڕەوی ئەساسی داواکاری گشتییە بە پێی یاسایەکی پەرلەمان.

## بەشی دووەم

## ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا

**ماددەی ( ٩٧ )**

### ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا

ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا ئۆرگانی ممارەسەکردنی دەسەڵاتی قەزایە لە کاتالونیا، وەکو ئۆرگانێکی لامەرکەزی ئەنجوومەنی گشتیی و دەسەڵاتی قەزایی کار دەکات.

**ماددەی ( ٩٨ )**

### ئەرکەکانی ئەنجوومەنی قەزایی لە کاتالونیا

١) ئەرکەکانی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا ئەوانەن کە ئەم یاسای بنەڕەتیو یاسایی ئەساسی دەسەڵاتی قەزاییو ئەو یاسایانە کە پەرلەمان پەسەندی دەکات لەگەڵ ئەوانەی کە ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی ڕێی پێ دەدات.

٢) دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا ئەم بابەتانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١. پێشنیارەکانی سەرۆکی باڵای قەزایی کاتالونیا بۆ ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی سەبارەت بە

دامەزراندنی سەرۆکەکانی دادگاکانی دادگای باڵاو سەرۆکەکانی دادگاکانی پارێزگاکان.

٢. دەرکردنی فەرمانەکانی دامەزراندن و فەرمانەکانی لادانی دادوەران و راوێژکارانی یاسایی.

٣. کردنەوەی دۆسیەو دانانی سزاکان لەسەر هەڵە سووک و مەترسیدارەکان کە لە لایەن دادوەرانەوە ئەنجام دەدرێن.

٤. بەشداری کردن لە دارشتنی بەرنامەکانی پشکنینی دادگاکان و چاودێری کردن و پێشکەش کردنی پێشنیارەکان لەم بوارەداو رەچاوکردنی فەرمانەکانی پشکنینی دادگاکان.

٥. چارەسەرکردنی توانجەکانی تێهەڵچوونەوە.

٦. پەرەپێدان و پیادەکردنی تەشریعاتی ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی لەسنوری کاتالونیا.

٧. ئاگادارکردنەوە سەبارەت بە پێشنیارەکانی پێداچوونەوە، دیاری کردنی دەستکاری لە ناوچەکانی هەرێمایەتی ئۆرگانەکانی قەزایی و پێشنیارەکانی دامەزراندنی بەش و دادگاکان.

٨. پێشکەش کردنی یاداشتێکی ساڵانە بۆ پەرلەمان دەربارەی بارودۆخ و چۆنیەتی راپەڕاندنی ئەرکەکانی ئیدارەی قەزا لە کاتالونیا.

٩. کۆنترۆڵ کردنی شەرعیەتی بڕیارەکانی دادگاکان و دەستەی دادوەران و دادوەرە پلە بەرزەکان.

١٠. تێکڕای ئەو اختصاصانە کە بەپێی یاسای ئەساسی دەسەڵاتی قەزایی و یاساکانی پەرلەمان پێی دەدەن لەگەڵ ئەوانەی کە ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی ڕێی پێدەدات.

٣) بڕیارەکانی ئەنجومەنی قەزایی کاتالونیا لە بابەتەکانی دامەزراندن، مۆڵەتدان و ئیزن وەرگرتن پێویستە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو پێوەرانە کە لەلایەن نیزامی ئەنجومەنی گشتی قەزاییەوە پەسندکراون.

٤) بریکارەکانی ئەنجومەنی قەزایی کاتالونیا لە بابەتەکانی دامەزراندن، مۆڵەتدان و ئیزن وەرگرتن پێویستە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو پێوەرانە کە لەلایەن نیزامی ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزاییەوە پەسندکراون.

٥) ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا، لەڕێگای سەرۆکەکەیەوە، پێویستە ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی ئاگادار بکاتەوە لەو بڕیارانەی کە وەری دەگرێت.

ماددەی (٩٩)

## پێکهاتەو کاروباری ڕێکخستن و کارەکانی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا

١) ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا پێك هاتووە لە سەرۆکی دادگای باڵای قەزایی کاتالونیاو شەش ئەندام بۆ ماوەی شەش ساڵ لەلایەن ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایەوە دیاری کراون لەسەر پێشنیاری پەرلەمان بە زۆرینەی ٥/١ پەسند کراون. سێ لەو ئەندامانە پێویستە دادوەر بێ و بەلانی کەمەوە پێنج ساڵ ممارەسەی ئەو ئەرکەیان کردبێت لە کاتالونیا. سێ ئەندامەکەی دی پێویستە مافپەروەری ناسراو بن و دانیشتووی کاتالونیاو (١٥) پازدە سالیش ممارەسەی پیشەی مافپەروەریان کردبێت. پێویستە لە چوارچێوەی یاسادا ئەندامانی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا نوێ بکرێنەوە بە ڕادەی ٣/١.

٢) ئەندامە هەرێمایەتیەکانی ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی کەوا ئەرکەکانیان لە کاتالونیا جێبەجێدەکەن دەتوانن ئامادەی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا بن بەبێ مافی دەنگدان.

٣) پەیڕەوی ناوخۆیی ئەندامانی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا هەمان پەیڕەوی ناوخۆیی ئەندمانی ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی دەوڵەتە.

٤) ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا نیزامی ناوخۆیی خۆی پەسند دەکات.

**ماددەی (١٠٠)**

## کۆنترۆڵ کردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا

١- ئەو بڕیارانەی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا کە کار لە پەیڕەوی ناوخۆیی دادوەران و راوێژکارانی یاسایی بکات لەبەردەم ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی قەزایی توانجیان لێ دەدرێت.

٢- ئەو بڕیارانەی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا کە لەبەردەم ئەنجوومەنی دەسەڵاتی قەزایی توانجیان لێ نەدرێت، دەتوانرێت لە ڕێگای ناکۆکی- ئیداری لەبەردەم دادگای باڵای قەزایی کاتالونیا توانجیان لێ بدرێت.

# بەشی سێهەم
# دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی لەسەر ئیدارەی قەزایی

## ماددەی (١٠١)
## پێشبڕکێیەکانی پڕکردنەوەی وەزیفەکان

١. ئەنجوومەنی گشتی بانگەشە بۆ پێشبڕکێیەکان دەکات بۆ پڕکردنەوەی شوێنە بەتاڵەکانی دادوەرانو راوێژکارانی یاسایی‌و داواکارانی گشتی لە کاتالونیا لە ڕێگەی حکومەتی ناوەندی، ئەنجوومەنی گشتی دەسەلاتی قەزایی یان ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا بەگوێرەی پێداویستیەکان.

٢. ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا بانگەشەی پێشبڕکێیەکان دەکات بۆ پڕکردنەوەی جێگا بەتاڵەکانی دادوەرانو راوێژکارانی یاسایی لە کاتالونیا لەسەر ڕەزامەندی ئەنجوومەنی دەسەڵاتی قەزایی.

٣. پێشبڕکێ بۆ پڕکردنەوەی جێگا بەتاڵەکانی داواکاری گشتی لە کاتالونیا لەلایەن حکومەتەوە بانگەشەی بۆ دەکرێت بە ڕەزامەندی داواکاری گشتی ناوەندو داواکاری باڵای کاتالونیا. ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە تاقی کردنەوەکانی هەڵبژاردنو پەسندکردن.

٤. تاقیکردنەوەکانی پێشبڕکێیەکان کە لەم ماوەیەدا رێك خراون دەکرێت بەهەر کام لە هەردوو زمانە فەرمیەکان لە کاتالونیا ئەنجام بدرێن.

**ماددەی (١٠٢)**

## مەرجەکانی میلاکاتی قەزایی‌و تیکڕایی ئیدارەی قەزا لە کاتالونیا

١. بۆ پڕکردنەوەی هەر جێگایەکی راوێژکاری گشتی‌و دادوەرانو داواکاری گشتی لە کاتالونیا کاندیدکراوەکان لەبەردەم یاسادا یەکسانن. پێویستە زانیاریەکی باشیان لە زمانی کاتالان هەبێت بۆ مسۆگەر کردنی مافە زمانەوانیەکانی هاوڵاتیان بەو شێوە کە لە یاسادا دیاری کراون.

٢. راوێژکارانی یاسایی‌و دادوەران کە لە کاتالونیا وەزیفە وەردەگرن پێویستە زانیاریەکی باشیان لە یاسای تایبەتمەندی کاتالونیا هەبێت بەو شێوەیە کە لە یاسادا دیاری کراوە.

٣. لە هەموو حاڵەتەکاندا زانیاریەکی باش لە زمانو یاسا مەرجێکە بۆ وەرگرتنی لە حاڵەتی گواستنەوەدا.

٤. ئەمینداره قەزاییەکانو تێکڕای ئیدارەی قەزاو داواکاری گشتی لە کاتالونیا پێویستە هەمان مەرجی زانیاری زمانی کاتالانی هەبێت کە بۆ میلاکاتی ئیدارەی ئەنجوومەنی گشتی داوا دەکرێن.

٥. پێویستە لەسەر ئەنجوومەنی قەزایی لە کاتالونیا لە جێبەجێکردنی مەرجەکانی ئەم ماددەیە بکۆڵێتەوە کە دانراون بۆ پڕکردنەوەی پۆستەکان تۆرگانە قەزاییەکانو ئیدارەی قەزاو داواکاری گشتی لە کاتالونیا.

## ماددەی (١٠٣)

## هۆکارە کەسایەتیەکان

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تەشریعی هەیە لەسەر میلاکاتی ئیداریی دەسەڵاتی قەزایی، بە ئەمینداره قەزاییو پزیشکە شەرعیەکانیشەوە بێ هیچ مەرجێك جگە لە مەرجی ڕێزگرتن لە پەیڕەوی ناوخۆیی ئەو میلاکاتە نەبێت کە ڕاستەوخۆ بەپێی یاسایی ئەساسی دەسەڵاتی قەزایی دانراوە.

لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەو دەسەڵاتانە پێك هاتووە لە ڕێکخستنی:

١. ڕێکخستن پلەو پایەی ئەم میلاکاتانە.

٢. پرۆسەی هەڵبژاردنو تاقیکردنەوەکان.

٣. ڕاهێنانو ڕێکخستنی خولی زانیارییە سەرەتاییەکان.

٤. بەرزکردنەوەو داگرتنی پلە وەزیفیەکان.

٥. بولرە ئیداریەکان.

٦. سیستەمی مووچە.

٧. رۆژانەی کرێکارو ماوەی کارکردن.

٨. رێکخستنی چالاکی پیشەیی و وەزیفەکان.

٩. مۆڵەتو پشوو بۆنەکانو کۆنەکردنەوەی وەزیفەکان.

١٠. تۆماری میلاکات.

١١. سیستەمی دیسپلین.

٢- پێویستە بەپێی یاسای پەرلەمان ئەوداموودەزگایەنە رێك بخرێت کە لە خزمەتی ئیدارەی قەزایی دایە.

٣- دەسەلاتی جێبەجێکردنو ئیدارەکردنی میلاکاتی قەزا لە چوارچێوەی دەسەلاتەکانی ئەنجوومەنی گشتیە، ئەم سەلاحیاتانە لە هەموو حالەتێکدا بریتییە:

١- رازی بوون لەسەر هەلەکانی کارکردن.

٢- چارەسەرکردنی پرۆسەکانی هەڵبژاردنو تەرخان کردنی هەلەکانی کارکردن.

٣- دامەزراندنی ئەو کەسانە کە لە پرۆسەکانی تاقیکردنەوە سەردەکەون.

٤- کردنەوەی خولی راهێنانی پێشوەختەو بە بەردەوامی.

٥- ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی کارکردن.

٦- ڕێکخستنی تۆماری میلاکات.

٧- ممارەسەکردنی دەسەڵاتی دیسپلین‌و دانانی سزاکان.

٨- میلاکاتە ئیداریەکانی قەزا بەشێکن لە میلاکاتی گشتی ئەنجومەنی گشتی.

٩- ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی لەسەر میلاکاتی کاتی‌و کارگەلی ئیداریی قەزا هەیە.

## ماددەی (١٠٤)

## هۆکارە ماددییەکان

١. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر هۆکارە ماددیەکانی ئیدارەی قەزا لە کاتالونیا.

٢. لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەو دەسەڵاتە بریتییە لە:

١. دورست کردن‌و چاك کردنەوەی باڵەخانەکانی قەزایی‌و داواکاری گشتی.

٢. دابین کردنی ماڵی گوێزراوەو کەلوپەل بۆ دامو دەزگاکانی قەزاو داواکاری گشتی.

٣. دانانی سیستەمی زانستی‌و کۆمپیوتەرو هۆکارەکانی پەیوەندی کردن.

٤. بەڕێوەبردن‌و پاراستنی ئەرشیف‌و پارچە گران بەهاکان.

٥. ئیدارەکردنی کۆگاکان.

٦. ئیدارەکردن و ساغ کردنەوەو کۆکردنەوەی رسوماتی قەزایی.

**ماددەی (١٠٥)**

**فەرمانگەی قەزایی، ئۆرگان و خزمەتگوزاریەکانی پشتگیری کردن.** پێویستە لەسەر ئەنجومەنی گشتی بوارەکانی دامەزراندن، نەخشەسازی، کاروباری رێکخستن، ئیدارەی فەرمانگەکانی قەزایی، ئۆرگانەکانی خزمەتگوزاریەکانی پشتگیری دیاری بکات، وەکو رێکخستنی دامەزراوەکان و پەیمانگاو خزمەتگوزاریەکانی پزیشکی شەرعی و زانستی ژەهرەکان.

**ماددەی (١٠٦)**

**قەزایی خۆرایی، رێوشوێنی تەحکیمی و ناوبژیوانی و ئاشتبوونەوە.**

١. لە دەسەڵاتەکان ئەنجومەنی گشتی رێکخستنی خزمەتگوزاریەکانی قەزای خۆرایی و رێنماییە قەزاییەکانە.

٢. ئەنجومەنی گشتی دەتوانێت ئامراز و رێوشوێنەکانی تەحکیمی و ناوبژیوانی و ئاشتبوونەوە دابنێت بۆ

چارەسەرکردنی ئەو کێشانە کە لە چوارچـێوەی دەسـەڵاتی خۆی دایە.

**ماددەی (١٠٧)**

## میلاکات و دەسەڵاتەکانی قەزایی

١. حکومەتی کاتالونیا هەر پێنج ساڵ جارێك بە ئاگادارکردنەوەی پێشوەختی ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا، پێویستە پێشنیاری پێداچوونەوە بە میلاکاتی قەزایی لە کاتالونیا بکات و بخرێتە بەردەم حکومەتی ناوەندی، پێویستە ئەو پێشنازە لە چوارچێوەی ئەو پرۆژە یاسایەدا بێت کە حکومەتی ناوەندی رەوانەی پەرلەمانی ئیسپانی دەکات.

٢. کردنەوەی بەش و دادگاکان و دەستکاری کردنی میلاکاتی قەزایی پێویستە بە ریفۆرمی تەشریعی ناکات و دەبێ حکومەتی کاتالونیا پێشوەخت ئەنجومەنی قەزایی کاتالونیا ئاگاداربکاتەوە.

٣. رێوشوێنی فەرمانگە قەزاییەکان بە یاسایی پەرلەمان دیاری دەکرێت.

### ماددەی ( ١٠٨ )

## قەزایی ئاشتەوایی ( صلح )و قەزایی بە پەلە.

١. ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لەسەر قەزایی ئاشتەوایی (قضاء الصلح) لە چوارچێوەی یاسادا. ئەو دەسەڵاتە، لە هەموو حاڵەتەکاندا، بریتییە لە دەستنیشان کردنی دادوەران، لە رێگای ئەنجوومەنی قەزایی کاتالونیا، هەروەها قەرەبووکردنەوەشیان لە ئەستۆ دەگرێت‌و دەسەڵاتی هەیە بۆ دابین کردنی هۆکاری پێویست بۆ ممارەسەکردنی ئەرکەکانیان.

٢. ئەنجومەنی گشتی دەتوانێت بە پێی یاساو بە گوێرەی یاسایەکی ئەساسی دەسەڵاتی قەزایی لە شارۆچکەکان سیستەمێکی قەزایی بەپەلە دابنێت کە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشە بچوکەکان بێت بەپەلەو بەشێوەیەکی کارا.

### ماددەی ( ١٠٩ )

## بابەتی جێگرتن

ئەنجوومەنی گشتی، سەرەڕای ئەو دەسەڵاتانەی کە ئەم یاسای بنەڕەتیە بە ئاشکرا پێی داوە، ممارەسەی تێکڕای ئەو ئەرك‌و دەسەڵاتانە دەکات کە بەپێی یاسای ئەساسی دەسەڵاتی قەزایی

دراوەتە حکومەتی ناوەندی سەباردت بە ئیدارەی قەزایی لە کاتالونیا.

## دەروازەی چوارەم

## دەربارەی سەلاحیاتەکان

## بەشی یەکەم

## جۆری سەلاحیاتەکان

### ماددەی (١١٠)

### سەلاحیاتە تایبەتمەندییەکان

١. ئەنجوومەنی گشتی لە بواری سەلاحیاتە تایبەتمەندیەکانی خۆی بەشێوەیەکی تایبەتی، بێ سنووردانان، جگە لە مەرجی ڕێزگرتن لەو بنەما سەرەکیانە نەبێت کە لە ماددەی (١٤٩، ١، أ) دەستووری ئیسپانیا ئاماژەی پێ دەکات، ممارەسەی دەسەڵاتی یاسادانان، دەسەڵاتی ئیزامی تەشریعیو دەسەڵاتی جێبەجێکردنی دەکات. ممارەسە کردنی ئەم دەسەڵاتانە تەنیا بۆ ئەنجومەنی گشتییەو لە ڕێگای ئەم دەسەڵاتانەوە دەتوانێت سیاسەتە تایبەتمەندیەکانی دابنێت.

٢. ئەنجوومەنی گشتی یاسای کاتالان لە سنووری خاکی خۆی لە پێشەوەی هەر یاسایەکی تر دادەنێت.

## ماددەی ( ١١١ )

## سەڵاحیاتە هاوبەشەکان

لەو بابەتانەی کە ئەم یاسایی بنەڕەتیە دەیداتە ئەنجوومەنی گشتی بە شێوەیەکی هاوبەش لەگەڵ دەوڵەت، ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی یاسادانان، دەسەڵاتی نیزامی تەشریعی، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی هەیە لە چوارچێوەی ئەو پرنسیپو ئامانجانە کە دەوڵەت دیاری کردووە، تەنیا لەو حاڵەتانە نەبێت کە دەستووری ئیسپانیو ئەم یاسایی بنەڕەتیە دیاری کردووە. لە بواری ممارەسەکردنی ئەم سەڵاحیاتانە، ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت سیاسەتە تایبەتیەکان دابڕێژێت. پێویستە پەرلەمان لە ڕێگای یاسایەکەوە ئەم بوارانە کارا بکات.

## ماددەی ( ١١٢ )

## سەڵاحیاتی جێبەجێکردن

سەڵاحیاتی ئەنجوومەنی گشتی بەپێی ئەم یاسایی بنەڕەتیە بریتییە لە ئەرکی ڕاپەڕاندن، دەسەڵاتی نیزامی تەشریعی بە پەسندکردنی نیزامەکانی پەرەپێدانو جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دەوڵەتیش دەگرێـەوە بۆ ڕاگرتنی نیزامی گشتی ئەم بابەتە، هەروەها تەواوی ئەرکی جێبەجێکردن، کە لە هەموو حالەتەکاندا، پێك هاتووە لە دەسەڵاتی ڕێکخستنی ئیدارەی تایبەتی خۆی، چالاکیەکانی پلان

ڕێژی‌و بەرنامەکان، چالاکی تۆماریی، دەسەڵاتەکاتی پشکنینی‌و سزادان، جێبەجێکردنی کۆمەک‌و یارمەتیەکان‌و تێکڕایی ئەو ئەرک‌و چالاکیانە کە ئیزامەکە دەیخاتە ئەستۆی ئیدارەی گشتی.

**ماددەی (۱۱۳)**

## دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی‌و پێوەرەکانی یەکێتی ئەوروپا

لە دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی، پەرەپێدان‌و پەیڕەوکردن‌و جێبەجێکردنی پێوەرەکانی یەکێتی ئەورووپایە، ئەگەر لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانیدا بێت، لەژێر ڕۆشنایی برگەو ناوەڕۆکی دەروازەی پێنجەم.

**ماددەی (۱۱٤)**

## بابەتی پشتگیری کردن

١. ئەنجوومەنی گشتی، لە چوارچێوەی سەلاحیاتی خۆی، ممارەسەکردنی بابەتەکان پشتگیری کردن دەکات. بۆ ئەو مەبەستەش بە گوێرەی یاساکانی پەرلەمان، ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت یارمەتی دارایی ببەخشێت، بەدیاری کردنی ئامانج‌و ڕێوشوێنەکانی ئەو بەخشینە.

٢. پێویستە لەسەر ئەنجوومەنی گشتی، لەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتە تایبەتمەندەکانی خۆیەتی، مەبەستی

بەخشینی پارەتیەکانی حکومەتی ناوەندی‌و پارەتیەکانی یەکێتی ئەوروپا دیاری بکات. هەروەها پێویستە پارەتیەکانی حکومەتی ناوەندی وەکو داهاتی تایبەتی بخرێتە سەر دارایی ئەنجوومەنی گشتی.

٣. پێویستە لەسەر ئەنجوومەنی گشتی، لە چوارچێوەی دەسەڵاتە هاوبەشەکانیدا، مەبەست‌و ڕێوشوێنی‌و کۆمەك‌و پارەتیەکانی حکومەتی ناوەندی‌و یەکێتی ئەوروپا دیاری بکات‌و ڕێوشوێنی گونجاو بگرێتەبەر بۆ ئیدارەکردن‌و سەرف کردنی ئەو پارەتیانە.

٤. پێویستە لەسەر ئەنجوومەنی گشتی، لە چوارچێوەی سەڵاحیاتی دەسەڵاتی جێبەجێکردندا، ئەرمەی بەڕێوەبردنی کۆمەك‌و پارەتیەکانی حکومەتی ناوەندی‌و یەکێتی ئەوروپا بکات.

**ماددەی (١١٥)**

## بواری هەرێمایەتی‌و کاریگەری سەڵاحیاتەکان

١. چوارچێوەی بابەتی دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی تایبەتە بە سنووری کاتالۆنیا، جگە لەو دەسەڵاتانە نەبێت کە ئەم یاسای بنەڕەتی‌و یاسا تەشریعیەکانی تر ئاماژەی

پێ دەکەن تایبەتە بە دەرەوەی سنوورو دەسەڵاتی ئەنجوومەنی گشتی.

٢. ئەنجوومەنی گشتی، لەو حاڵەتانەی کە سەڵاحیاتەکان دەکەوێتە دەرەوەی سنووری خاکی کاتالونیا، ممارەسەی ئەو سەڵاحیاتانە دەکات کە لە خاکی خۆی دایە، بێ زیان گەیاندن بەو دەسەڵاتانە کە لەم یاسایی بنەڕەتی بۆ هەر بابەتێك دانراوە.

سەبارەت بەو سەلاحیاتانەی کە چالاکیە گشتیەکانی شیاوی دابەش کردن نەبوون، پێویستە ئەنجوومەنی گشتی لەرێگای رێکەوتن لەگەڵ ئەو کیانە هەرێمایەتیانە کە هەمان دەسەڵاتیان هەیە سەبارەت بەو بابەتە، ئامرازی هاریکاری پێویست دابنێت بۆ ممارسەکردنی دەسەڵاتەکان لە خاکی مەبەست، ئەگەر ئەو هاریکاریە مەیسەر نەکرا، ئەوە دەوڵەت لە رێگای ئیتفاقی لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- حکومەتی ناوەندی، دەتوانێت میکانیزمی هەماهەنگی دروست بکات، بۆ ممارسەکردنی ئەو دەسەڵاتانە.

## بەشی دووەم

## بابەتەکانی سەلاحیات

### ماددەی (١١٦)

### کشتوکاڵو ئاژەڵداری و بەکارخستنی دارستانەکان

١- بوارەکانی کشتوکاڵو ئاژەڵداری لە سەلاحیاتە تایبەتمەندەکانی ئەنجوومەنی گشتییە تەنیا بابەتەکانی بڕگەی (٢) نەبێت.

ئەم سەلاحیاتانە لە هەموو حاڵەتەکان بریتییە لە:

١. ڕێکخستنو پەرەپێدان بە کەرتی کشتوکاڵو ئاژەڵداریو تێکڕایی ئەو بوارانە کە پەیوەندیان پێوە هەیە.

٢. پلان دانانو چاك کردنی جۆرەکانی بەروبوومی کشتوکاڵیو ئاژەڵداریو بەروبوومە خۆراکیەکان.

٣. ڕێکخستنی جۆری بەشداریکردنی ڕێکخراوە کشتوکاڵیو ئاژەڵداریەکان لە کەرتە گشتییەکان.

٤. بواری دروستی ڕووەکیو ئاژەڵی لەو حاڵەتانە کە کاریگەری سەلمێنراوی لەسەر ژینگەی مرۆییو پاراستنی گیانلەبەرەکان نەبێت.

٥. تۆو نەمامگەکانو پاراستنی ڕووەکەکان.

٦. ڕێکخستنی پرۆسەکانی بەرهەمهێنانو وەبەرهێنانو ژێرخانی کشتوکاڵیو سیستەمی یاسایی.

٧. پێشکەوتن‌و پاراستنی جیهانی لادێ.

٨. ڕێکخستن‌و دانانی سیستەمی گونجاو بۆ بەڕێوەبردن‌و بەکارهێنانی چیاکان‌و دارستانەکان‌و ڕێگاکانی بەخێوکردنی مەڕو ماڵات لە کاتالونیا.

٩. توێژینەوە، پەرەپێدان، گواستنەوەی تەکنەلۆژیاو نوژن کردنەوەی وەبەرهێنانی کشتوکاڵی‌و بەرووبوومە خۆراکیەکان‌و زانیاری وەرگرتن لەو بوارانە.

١٠. پێشانگاو کێبڕکیەکان لە بواری کشتوکاڵی‌و دارستان‌و ئاژەڵداریی.

٢- پلان ڕێژیی لە بواری کشتوکاڵی‌و ئاژەڵداری لە سەلاحیاتی هاوبەش ئەنجوومەنی گشتی دایە.

## ماددەی (١١٧)

## ئاوو کاروباری هایدرۆلۆکی

١) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لەسەر ڕێکخستنی ئاوی حەوزە هیدرۆگرافیەکان لەنێوان کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکان، کە لە هەمرو حاڵەتەکاندا بریتییە لە:

١- ڕێکخستن‌و پلان ڕێژی‌و بەڕێوەبردنی بواری ئاوی سەر زەوی‌و ژێرە زەوی‌و بەکارهێنان‌و بەکارخستنی هیدرۆلیکی لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە گشتییەکاندا.

٢- پلان دارشتنو گرتنەبەری ڕێوشوێنو ئامرازی تایبەتمەندی بەڕێوەبردنو پاراستنی سەرچاوە هایدرۆلیکەکانو دانانی سیستەمی ئاودێری پێشکەوتوو.

٣- گرتنەبەری ڕێوشوێنی نا ئاسایی لە حاڵەتی پێویستدا بۆ مسۆگەر کردنی ئاوی پێویست.

٤- ڕێکخستنی ئیدارەی هایدرۆلیك لە کاتالونیا، بە بەشداری کردنو بەکارهێنانیشیەوە.

٥- ڕێکخستنی کاروبارەکانی کەرتی ئاودێری.

٢) جێبەجێکردنی تەشریعاتی حکومەتی ناوەندی لەسەر کەرتی گشتی هایدرۆلیكو وەبەرهێنانو ئیشو کارەکانی بەرژەوەندی گشتی لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەنجومەنی گشتی دایە.

٣) ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە پلان ڕێژی هایدرۆلۆژیاو لە ئۆرگانەکانی بەڕێوەبەرایەتی حکومەتی ناوەندی لە بواری سەرچاوە هایدرۆلیکەکانو بەکارهێنانیان.

٤) پێویستە ئەنجوومەنی گشتی راپۆرتێکی یەکلایکەرەوە بڵاوبکاتەوە لەسەر هەر پێشنیارێکی گواستنەوەی ئەو حەوزانە کە پێوستیان بە دەستکاری هەیە لە سەرچاوە هیدرۆلیکەکان لە خاکی کاتالونیا.

٥) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە جۆربەجۆرکردن و ڕێکخستنی پلانەکانی هایدرۆلۆژیای سەرچاوە هیدرۆلیکەکان و بەکارخستنی هایدرۆلیک کە بە خاکی کاتالونیادا تێدەپەڕن یان لەوێدا کۆتاییان پێ دێت یان لە دەرەوەی سنووری حکومەتی ناوەندی تێیاندا دان، بەپێی ئەو میکانیزمە کە لە دەروازەی پێنجەم هاتووە.

#### ماددەی (١١٨)

### کۆمەڵەو دامەزراوەکان

١. ئەنجوومەنی گشتی سەڵاحیاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر نیزامی یاسایی ئەو کۆمەڵانە کە زۆرترین مارەسەی چالاکیەکانیان لە کاتالونیا دەکەن.

٢. ئەنجوومەنی گشتی سەڵاحیاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر نیزامی یاسایی ئەو دامەزراوانە کە بە زۆری مارەسەی چالاکیەکانیان لە کاتالونیا دەکەن.

٣. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری ڕێکخستنی یاسای کۆمەڵەکان. پێویستە ئەنجوومەنی گشتی مارەسەی ئەم سەڵاحیاتانە بکات، بە ڕێزگرتن لە پێشکەوتنی ڕاستەوخۆی هۆکارە سەرەکیەکانی ئەم یاسایە.

٤. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی دیاری کردنی پێوەرەکانو ڕێکخستنی مەرجەکانو جێبەجێکردنو کۆنترۆڵ کردنی کۆمەكو یارمەتیە حکومیەکان هەیە لە بابەتی کۆمەڵەو دامەزراوەکان.

## ماددەی (١١٩)

## ڕاوکردن، سامانی ماسی، چالاکیە دەریاییەکانو ڕێکخستنی کەرتی سامانی ماسی.

١) ئەنجوومەنی گشتی سەڵاحیاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر بابەتەکانی ڕاوکردنی سامانی ماسی لە ڕووبارەکان. بۆ ئەم مەبەستە نیزامی یاسایی دادەنرێت سەبارەت بە چاودێری کردنو گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو لەپێناو پاراستنی جۆرەکانو دانانی نیزامی سزایی.

٢) ئەنجوومەنی گشتی سەڵاحیاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری ڕاوە ماسی دەریایی لە ئاوە ناوخۆییەکان، هەروەها ڕێکخستنو ئیدارەکردنی سەرچاوەکانی ڕاوە ماسیو دیاری کردنی ناوچە پارێزراوەکان.

٣) ئەنجوومەنی گشتی سەڵاحیاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری چالاکیەکانی دەریایی لە ئاوەکانی ناوەوەو دەرەوە.

٤) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری پلان ڕێژیو ڕێکخستنی کەرتی ڕاوە ماسی.

## ماددەی (١٢٠)

## سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن

١) ئەنجوومەنی گشتی، لە بابەتی سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن، کە جێگای چالاکییەکانی کاتالونیایە، لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەم دەسەڵاتانە بریتییە لە:

١- دیاری کردنی ئۆرگانە سەرەکیەکان.

٢- نیزامی یاسایی ئەندامانی ئۆرگانە سەرەکیەکانو تێکڕای وەزیفەکانی تری سەندووقەکانی تەوفیر.

٣- نیزامی یاسایی دامەزراندن، یەکگرتن، ساخ کردنەوەو تۆمارکردن.

٤- ممارەسەکردنی دەسەلاتەکانی نیداریی سەبارەت بەو دامەزراوانە کە دروست دەکرێن.

٥- ڕێکخستنی گروپەکانی سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن کە بارەگای هاوبەشیان لە کاتالونیایە.

٦- چاودێری کردنی پرۆسەی بلاوکردنەوەو دابەشکردنی پشکە بەشداربووەکان.

٢) ئەنجوومەنی گشتی، لە بابەتی سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن کە نیشتەجێی کاتالونیان، دەسەڵاتی هاوبەش هەیە لەسەر چالاکی دارایی، بە گوێرەی پرنسیپەکانو ئەو رێسایانە کە تەشریعاتی سەرەکی دەوڵەت دایناوە دەربارەی ئیتمانو سیاسەتی دارایی دەوڵەت. لەنێوان ئەو بناغە سەرەکیانە دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی، بریتییە لە رێکخستنو دابەشکردنی زیادیەکانیو کاری هاوپشکی سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن.

٣) ئەنجوومەنی گشتی، لەبابەتی سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن کە لە کاتالونیا نیشتەجێن، دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر دیسپلینو پشکنینو سزای سەندووقەکانی تەوفیر، بە گوێرەی پرنسیپەکانو ئەو رێسایانە کە تەشریعی ئەساسی دەوڵەت دایناوە بۆ رێکخستنی ئیتمانو بانك.

٤) ئەنجوومەنی گشتی هاوکاری دەکات لە چالاکیەکانی پشکنینو ئەو سزایانە کە وەزارەتی ئابووریو دارایی‌و بانکی ئیسپانیا دایناوە لەسەر سەندووقەکانی پاشەکەفت کردن لە کاتالونیا.

٥) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر چالاکی دارایی، دیسپلین، پشکنینو سزای سەندووقەکانی

توفیر کە لە کاتالونیا کار دەکەن، بە گوێرەی ئەو پرنسیپو تەشریعی سەرەکیە کە دەوڵەتی ناوەندنی دایناوە لەسەر ڕێکخستنی ئیتمانو بانکی زەمان بەپێی ڕێساکان هەماهەنگی کە دەوڵەت دیاری کردووە.

## ماددەی (١٢١)

## بازرگانیو پێشانگاکان

١) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری بابەتی بازرگانیو پێشانگاکان، کە پێك هاتووە لە ڕێکخستنی چالاکی پێشانگایی نێودەوڵەتیو ڕێکخستنی ئیداری چالاکی بازرگانی کە بریتییە لە:

١- دیاری کردنی جۆری چالاکیو هەلومەرجەکانی ئیداری پێویست بۆ ممارەسەکردنیانو دیاری کردنی ئەو شوێنانە کە تیایدا ممارەسەی چالاکیەکانیان دەکەن.

٢- ڕێکخستنی ئیداری تێکڕای جۆرەکانی فرۆشتن لەگەڵ شێوەکانی پێشکەشکردنی چالاکی بازرگانی.

٣- ڕێکخستنی کاتەکانی بازرگانی.

٤- پۆلین کردنو پلان ڕێژی لە ئاستی هەرێمایەتی دامودەزگا بازرگانیەکانو ڕێکخستنی مەرجەکانو

دانانی نیزامی دامەزراوەییو بەرفراوان کردنو گۆڕینی چالاکی دامەزراوەکان.

٥- دانانی ئەو ڕێساو ستاندەرو جۆرەنە کە پەیوەندیان بە چالاکی بازرگانیەوە.

٦- گرتنەبەری ڕێوشوێنی پۆلیسی ئیداری سەبارەت بە دیسپلینی بازاڕ.

٢) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی هەیە لەسەر بابەتی ئەو پێشانگا نێودەوڵەتیانە کە لە کاتالونیا ساز دەدرێن کە بریتین لە:

١- مۆڵەتو تصریحاتی پێشانگای نێودەوڵەتی.

٢- پشتگیریو ئیدارەو هەماهەنگی کردن.

٣- چالاکی پشکنینو نرخاندنو ڕێکخستنی ژمێریاری.

٤- دانانی پەیڕەوی ناوخۆیی.

٥- دەستنیشانکردنی یەکەیەکی ڕێپێدراو لە ئۆرگانەکانی بەڕێوەبردنی هەر پێشانگەیەك.

٣) ئەنجوومەنی گشتی هاوکاری لەگەڵ دەوڵەت دەکات لە دانانی کاتەکانی (تقویم) ی پێشانگا نێودەوڵەتیەکان.

## ماددەی (١٢٢)

## ڕاپرسیە میللیەکان

ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر دانانی نیزامی یاسایی، جۆرەکان، ڕێوشوێنەکانی جێبەجێکردنو بانگەشە کردن لەلایەن خودی ئەنجومەنی گشتی یان لەلایەن کیانە ناوچەیەکان لە بواری سەڵاحیاتی سەرژمێریو ئامارو هەژمارکردنو کۆبوونەوە گشتیەکانو گرووپەکانی بەشداری کردنو هەر ئامرازێکی دی راپرسی میللی.

## ماددەی (١٢٧)

## بەکاربراو (مستهلك)

ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری بەکاربراو کە بریتییە لە:

١ بەرگری کردن لە مافەکانی بەکاربراوەکانو بەکارهێنەران، کە لە ماددەی (٢٨) دا باسی لێوە کراوە، هەروەها دانانو پیادە کردنی ڕێوشوێنی نیداری سەبارەت بە سکاڵاو داواکاریەکان.

٢ ڕێکخستنو پشتگیری کردنی کۆمەڵەکانی بەکاربراوەو بەکارهێنەرەکانو بەشداری کردنیان لەو ڕێوشوێنانە کە پەیوەندیان پێوە هەیە.

٣- زانیاریو پەروەردە لە بواری بەرکاربراودا.

٤- پێناسەکردنی بەکاربراو.

٥- ڕێکخستنی زانیاریەکان.

**ماددەی (١٢٤)**

## هەرەوەزی و ئابووری هاوبەشی بازرگانی

١. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری بابەتی هەرەوەزی کە زۆرترین چالاکیەکانیان لەگەڵ بەشداربووانی نێو کاتالونیا ئەنجام دەدەن یان هەرچەندە چالاکیەکانیان لە کاتالونیا ئەنجام نادەن بەڵام جێگای نیشەجێبوونیان کاتالۆنیایەو لە ئۆتۆنۆمیەکانی تر ئەنجامی دەدەن.

٢. ئەو سەڵاحیاتانەی کە لە بڕگەی (١)دا ئاماژەی پێ کراوە بریتییە لە ڕێکخستن‌و ئەنجام دانی هەرەوەزیەکان کە بریتییە لە:

١. پێناسەو پۆلێن کردن.

٢. پێوەرەکانی نیشتەجێبوون.

٣. مەرجەکانی دامەزراندن‌و دەستکاری کردن لە نیزامە بازرگانیەکان‌و یەکگرتنەوەو جیابوونەوە،و گوازتنەوەو هەڵوەشاندنەوە.

٤. تۆمارکردن‌و دڵنیابوون لێیان.

٥. مافەو ئەرکەکانی بەشداربووان.

٦. نیزامی ئابووری و بەڵگەنامەکانی تۆمارکردن.

٧. ناوبژیوانی و تەحکیم کردن.

**ماددەی (١٢٥)**

## دەستەکانی یاسای گشتی و پیشەو بڕوانامەکانی

١) ئەنجومەنی گشتی، لە بابەتی سەندیکا پیشەیی، ئەکادیمی، ژوورەکانی کشتوکاڵی، بازرگانی، پیشەسازی و دەریاوانی و دەستەکانی تری یاسایی گشتی کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندییە ئابووری و پیشەییەکانی دەکات دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەو بابەتانە.

٢) ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بابەتی پێناسەکردنی ئەو دەستەو کۆمەڵانە کە لە برگەی (١)دا ئاماژەی پێ کراوە سەبارەت بە مەرجەکانی دامەزراندن و مەرجەکانی ئەندامێتی.

٣) ژوورەکانی بازرگانی، پیشەسازی و دەریاوانی، بە ڕەزامەندی پێشوەختی لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجومەنی گشتی- دەوڵەت دەتوانن مومارەسەی ئەرکەکانی بازرگانی دەرەوە بکەن.

٤) ئەنجوومەنی گشتی لە بابەتی ممارەسەکردنی ئەو پیشانە کە پێوستیان بە بڕوانامە هەیە، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە کە بریتییە لە:

١. دیاری کردنی هەلومەرجەکانی ممارەسەکردنی ئەو پیشانە.

٢. ماف و ئیلتزاماتی ئەو پیشانە.

٣. پاراستنی نهێنیەکانی پیشەیی.

٤. نیزامی دیسپلینی پیشەکان.

## ماددەی (١٢٦)

## ئیتمان، بانك، زەمان و کۆمپانیاکانی دڵنیابوون و سیستەمی زەمانی کۆمەڵایەتی.

١. ئەنجوومەنی گشتی، لە بواری ڕێکخستنی کاروباری ئیتمان، بانك، تأمین و زەمان و ئەو کۆمپانیانە کە لە چوارچێوەی سیستەمی دەستەبەری کۆمەڵایەتی نین، سەڵاحیاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر ستراکچەر و ڕێکخستن و ڕاپەڕاندنی کاروباری ئەو کۆمپانیانەی دەستەبەری کۆمەڵایەتی کە شوێنی کارکردنیان لە کاتالونیایە.

٢. ئەنجوومەنی گشتی، لە بابەتی ڕێکخستنی کاروباری بانك، ئیتمان، دەستەبەری کۆمەڵایەتی و ئەو کۆمپانیانەی دەستەبەری کۆمەڵایەتی کە لە چوارچێوەی سیستەمی

دەستەبەری کۆمەڵایەتی نین، دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر ستراچکەرو ڕێکخستنو کاری وەزیفەی (وسطاء) بە دارایییەکان کە پەیوەندی بە سەندووقی دەستەبەری کۆمەڵایەتیەوە نەبێت، یان دەستەکانی ئیتمان یان ئەو کیانە یاسایانە کە لە بازاڕدا کاردەکەن وەکو لە بڕگەی (١)دا ئاماژەی پێ کراوە.

ئەنجوومەنی گشتی، لە بواری ڕێکخستنی کاروباری ئیتمان، بانك، دەستەبەری کۆمەڵایەتیو ئەو کۆمپانیانە کە لە چوارچێوەی بیمەی کۆمەڵایەتیدا نین، دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر چالاکی ئەو کیانانە کە لە بڕگەی (١، ٢) دا ئاماژەی پێ کراوەو شوێنی کارکردنیان لە کاتالونیا دایە، بە گوێرەی پرنسیپو ئەو یاسایانە کە تەشریعی سەرەکی دەوڵەت ڕێکی دەخات بۆ ڕێکخستنی ئەو بوارانە کە لە دەرەوەی سنووری کاتالونیا دایە.

**ماددەی (١٢٧)**

## کەلتور

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری بابەتی کەلتور، تەنیا ئەوە نەبێت کە لە بڕگەکانی (٢، ٣)دا دەقنووس کراوە. ئەو دەسەڵاتە تایبەتمەندیە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- چالاکیە هونەریو ڕۆشنبیرییەکان کە بریتییە لە:

یەکەم: کاروباری ڕێکخستنو ڕاپەڕاندنی چالاکیەکانی بەرهەمهێنانو دابەش کردنو مەرجەکانی فرۆشتنی کتێبو بڵاوکراوە خولیەکان لە هەموو بوارەکانی ڕۆشنبیریدا، هەروەها بەخشینی ژمارەی سپاردنی یاسایی لەگەڵ کۆدی پێناسەکردن.

دووەم: ڕێکخستنی کاروباری پشکنینی هۆڵەکانی پیشاندانی سینەمایی‌و ڕێوشوێنەکانی پاراستنی پیشەسازی سینەمایی‌و کۆنترۆڵ کردنو بەخشینی مۆڵەتەکانی دۆبلاژکردن.

سێهەم: پۆلێن کردنی فلیمەکانو بابەتەکانی بیستراو بینراو بەگوێرەی تەمەنو بەها کەلتورییەکان.

چوارەم: پشتگیری کردن، پلان دانان، دروست کردنو ئیدارە کردنی ئەو سەنتەرە ڕۆشنبیریانە کە لە کاتالونیادا جێگیرن، بێ زیان گەیاندن بە ئەحکامەکانی بڕگەی (٣).

پێنجەم: دانانی ڕێوشوێنی دارایی بۆ هاندانی چالاکیە ڕۆشنبیرییەکان.

ب- سامانی کەلەپوری ڕۆشنبیری کە لە هەموو حاڵەتەکاندا بریتییە لە:

یەکەم: گرتنەبەری ڕێوشوێنی شیاو بۆ دەوڵەمەندکردنو بڵاوکردنەوەی کەلەپوری ڕۆشنبیری کاتالونیا.

دووەم: کاروباری ڕێکخستنی ڕێوشوێنەکانی پشکنینو جەردکردنو نۆژەن کردنەوەی کەلەپوری بیناسازی، ئارکیۆلۆژی، زانستی، تەکنیکی، مێژوویی، هونەریو ڕۆشنبیری بەگشتی.

سێیەم: دانانی نیزامی یاسایی بۆماڵی گوێزراو نەگوێزراوی کەلەلەپورو کەلتووری کاتالونیا.

چوارەم: پاراستنی کەلەپوری ڕۆشنبیری کاتالونیا، کە پێك دێت لە پاراستن، چاك کردنەوە، نیزامی چاودێریو کۆنترۆڵ کردنی سامانی ڕۆشنبیری، بێ زیان گەیاندن بە دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی سەبارەت بە داکۆکی کردن لەو کەلوپەلانەی کەلەپوری ڕۆشنبیری دژی دزیو تالآن کردن.

ج) ئەرشیف، کتێبخانەکان، مۆزەخانەو سەنتەرەکانی دی سپاردنی کەلەپوری کە لە دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی نین، لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

یەکەم: دامەزراندنو پاراستنیو دانانی نیزامی یاسایی بۆ ئەو سەنتەرانە کە لە چوارچێوەی سیستەمی ئەرشیفو کتێبخانەو مۆزەخانەو سەنتەرەکانی دی سپاردن کەلتورین.

دووەم: دانانی نیزامی یاسایی بۆ ڕێکخستنی سەروسامانی دۆکومێنتالیو بیبلۆگرافیو کەلتووریی کە لە کاتالونیادا پارێزراون.

سێهەم: راگرتن‌و گەڕاندنەوەی ئەو کەلوپەلانە کە مۆڵکی کەلەپووری دۆکومێنتال‌و بیلۆگرافیای کاتالانن.

د) سەڵاحیاتنی تایبەتمەند لە بابەتی ئەو کەلتورە کە پەیوەندی بە ئەرشیفی پاشایەتی هەیە لە بەرشلۆنە. پێویستە ئەو کۆگایانە لەچوارچێوەی سیستەمی ئەرشیفەکانی کاتالونیادا بن.

پێویستە ئەنجوومەنی گشتی هاریکاری بکات لەگەڵ دەستەی ئەرشیفی پاشایەتی شاری ئاراگۆن بۆ بەڕێوەبردنی کۆگا گشتییەکانی دی کە لە ناوچەکانی تری پاشیەتی ئاراگۆن دان.

پێویستە ئەنجوومەنی گشتی، لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی دی‌و دەوڵەت هاوکاری بکات بۆ پاراستنی ئەو شوێنە کەلتوریانە کە لە سنووری کاتالونیا دایە.

هـ) پشتیوانی کردنی بواری رۆشنبیری کە بریتییە لە:

یەکەم: پشتگیری کردنی داهێنان‌و بەرهەمهێنانی شانۆیی، مۆسیقا، هۆکارەکانی بیستراوو بینراو، ئەدەبی، هونەری سەماکردن، سێرک‌و ئەو چالاکیە هونەرییانە کە لە کاتالونیا ئەنجام دەدرێن.

دووەم: هان دان‌و بڵاوکردنەوەی کەلەپوری کەلتوری، هونەری‌و پەیکەرسازی‌و سەنتەرەکانی سپاردنی کەلتووریی کە لە کاتالونیادان.

سێهەم: پرۆژە نێودەوڵەتیەکانی کەلتوری کاتالان.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بابەتی ئەرشیف، کتێبخانە، مۆزەخانە، سەنتەرە ڕۆشنبیریەکانی حکومەتی ناوەندی لە کاتالونیا، کە پێك دێت لە کاروباری ڕێکخستنو ڕاپەراندنو دانانی نیزامی میلاکات.

٣- پێویستە پێشوەخت ڕەزامەندی لیژنەی دووقۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت وەربگیرێت سەبارەت بەو چالاکیانەی دەوڵەت کە لە کاتالونیا ئەنجام دەدرێن لە بواری ڕۆشنبیریدا. هەروەها بە هەمان شێوە ئەو چالاکیانە کە دەوڵەت ئەنجامی دەدات لەچوارچێوەی پرۆژە نێودەوڵەتیەکان لە بواری کەلتوری کاتالاندا.

**ماددەی (١٢٨)**

## ناوونیشانەکان

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری ناونیشانە ڕەسەنەکانو هەر ئاماژەییەکی دی کە بریتی بێت لە نیزامی یاسایی داهێنانو ڕاپەراندنی کارەکانی کە بریتییە لە:

أ- دەستنیشان کردنی ئاستەکانی پارێزگاری کردنی لە کەلوپەلەکان، نیزامو مەرجەکان، مافو ئەو ئیلتزاماتەی کە لێی دەبێتەوە.

ب- نیزامی ناونیشانەکانی ئەو ناوانە.

ج- ڕێکخستنی شێوەو مەرجەکانی بەرهەمهێنانو بازرگانی کردن بەو بەرهەمانە.

د- نیزامی ڕێکخستنی ئیداری ناوە ئەسڵیەکان یان هەر جۆرە ئاماژەیەکی تر.

**ماددەی (١٢٩)**

## یاسای مەدەنی

١- ئەنجوومەنی گشتی سەڵاحیاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری یاسای مەدەنیو دیاری کردنی سیستەمی سەرچاوەکانی ئەو یاسایەو پەیوەندیەکانی یاسای مەدەنی کە پەیوەستن بە شێوەکانی هاوسەرێتیو ڕێکخستنی تۆمارەکانو بەڵگەنامە گشتییەکانو ڕێساکانی ئیلتزاماتی گرێبەندیو ئەو ڕێسایانە کە چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی یاساکانو دیاری کردنی سەرچاوەکانی یاسایی سەڵاحیاتی حکومەتی ناوەندی دەکەن.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری ڕێکخستنی ئیلتزاماتی دەرەوەی گرێبەندەکانو جۆرە جیاجیاکانی ئەو گرێبەندانە لە چوارچێوەی ئەو ڕێسایانە کە لە بڕگەی (١) دا ئاماژەی پێکراوە.

**ماددەی ( ١٣٠ )**

## یاسای شێوازی دادگایی کردن ( اصول المحاکمات )

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە دەرچواندنی ڕێساو یاسایی شێوازی دادگایی کردنی تایبەتی کە بەشێکە لە تایبەتمەندییەکانی یاسایی ئەساسی کاتالونیا.

ئەو سەلاحیاتە بریتییە لە ڕێساکانی شێوازی دادگایی کردن کە ئامانجیان پاراستنی ئەو مافانەی هاوڵاتیلن کە لەم یاسایی بنەڕەتیدا هاتووە.

**ماددەی ( ١٣١ )**

## پەروەردەو فێرکردن

١- خوێندنی غەیرە زانکۆیی لە دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتییە لە چوارچێوەی خوێندنی غەیرە ئیلزامی کە مەبەستی وەدەستهێنانی بڕوانامەیەکی ئەکادیمیو پیشەپیشەیی نیە.

٢- ئەنجوومەنی گشتی لە بواری خوێندنی زانکۆییو ئەوەی پەیوەندی بە قۆناغەکانی ئیلزامیو غەیرە ئیلزامییە کە مەبەستیان وەدەستهێنانی بڕوانامەیەکی ئەکادیمیو پیشەییە، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە. ئەم دەسەڵاتە تێکڕای ئاستو قۆناغو خولو پلەو جۆرو تایبەتمەندییەکانی بواری پەروەردەو

فێرکردن دەگرێتەوە، لە هەموو حاڵەتێکدا، ئەم بابەتانەی خوارەوەیە.

١- پرۆگرامەکانی خوێندنو رێکخستنی ئۆرگانەکانی بەشداری کردنو راوێژکاری ئەو سەکتەرانە کە پەیوەندیان پێوە هەیە لە سنووری خۆیدا:

٢- دامەزراندنو رێکخستنی نیزامی سەنتەرە گشتییەکان.

٣- پشکنینو نرخاندنی سیستەمی پەروەردەیی، نوژەن کردنەوەو ئەنجام دانی توێژینەوەو تاقی کردنەوەی پەروەردەیی‌و مسۆگەر کردنی جۆرەکانی سیستەمی پەروەردەیی.

٤- دانانی نیزامی پشتگیریی خوێندنو زەماڵەو یارمەتی.

٥- سەقامگیری دارایی گشتی بۆ قوتابخانەکانی خوێندنی سیستەمی پەروەردەیی‌و سەنتەرەکانی وانە ووتنەوە.

٦- پێکهێنانو راهێنانی میلاکاتی وانە ووتنەوەو پیشە پەروەردەیەکانی دی بە گوێرەی ماددەی (١٣٦).

٧- خزمەتگوزاریە پەروەردەیەکانو چالاکیەکانی دەرەوەی قوتابخانەکانو یارمەتی دانی سەنتەرەکانی خوێندنی ئەهلی.

٨- رێکخستنی قوتابخانەکانی خوێندن بۆ بەساڵاچووان.

٩- ئەنجوومەنی گشتی، لەچوارچێوەی ئەو پرنسیپانە کە دەوڵەت دایناوە بۆ پەرەپێدانی لایەنە سەرەکیەکانی مافی پەروەردەیی‌و

ئازادی خوێندن و فێرکردنی غەیرە زانکۆیی و ئەوەی پەیوەندی بە خوێندنی ئیلزامیەوە هەیە و مەبەستی وەدەست هێنانی بڕوانامەی ئەکادیمی و پیشەییە، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە:

١- دانانی پلان و پرۆگرامەکانی خوێندن و پێناسەکردنیان.

٢- ڕێکخستنی پێوەرەکانی قەبول و ناونووس کردنی قوتابیان لە سەنتەرەکانی وانە ووتنەوە.

٣- ڕێکخستنی کەرتی خوێندن و چالاکی ستافی وانە ووتنەوە و پەروەردەیی.

٤- پێداویستی و مەرجەکانی سەنتەرەکانی وانە ووتنەوە و پەروەردەیی.

٥- بەشداری کردن لە کۆنترۆڵ و بەڕێوەبردنی سەنتەرەکانی وانە ووتنەوەی حکومی و ئەهلیەکان کە دەوڵەت پارەیان دەدات.

٦- وەرگرتنی کارمەندانی وانە ووتنەوە لەگەڵ لەدەستدانی مەرجەکانی قەبول کردن و ڕێکخستنی ماف و ئەرکە سەرەکییەکانیان.

٧- ئەنجوومەنی گشتی، لە بواری خوێندن و فێرکردنی غەیرە زانکۆیی، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی هەیە لە بواری پێدان و یەکسانی کردنی بڕوانامە ئەکادیمی و پیشەییەکانی حکومەتی ناوەندی.

**ماددەی (١٣٢)**

## حاڵەتی ناکاو و بەرگری مەدەنی

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری بەرگری مەدەنی کە بریتییە لە کاروباری ڕێکخستن و پلان دانان و جێبەجێکردنی ئەو ڕێوشوێنانە کە پەیوەندییان بە حاڵەتەکانی ناکاو ئاسایشی مەدەنی هەیە، هەروەها بەرپێوەبردن و تەنسیق کردن لە خزمەتگوزاریەکانی بەرگری مەدەنی، وەکو خۆپارێزی لە تەنها نەهێشتنی ئاگر کەوتنەوە، بێ زیان گەیاندن بە دەسەڵاتەکانی ئیدارەکانی ناوچەیی لەو بوارەدا.

٢- ئەنجوومەنی گشتی لەو حاڵەتانەی کە پەیوەندییان بە حاڵەتی ناکاوو بەرگری مەدەنیەوە هەیە لە کاتالونیا، پێویستە میکانزمی هاوکاری پێویست دابین بکات لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکان تری دەوڵەت.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی تەشریعی سەرەکی دەوڵەتی هەیە لە بواری ئاسایشی ناوەکی و فریاکەوتنی دەریایی.

**ماددەی (١٣٣)**

## وزەو کانگاکان

١) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بابەتی وزە، بەگوێرەی ئەو پرنسیپانە کە یاسای ئەساسی دەوڵەت دایناوە

سەبارەت بە نیزامی وەزیی‌و ئەو ڕێسایانە کە دەربارەی یەدەکەکانی ستراتیژی کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

١-ڕێکخستنی چالاکیەکانی بەرهەمهێنان‌و عەمبارکردن‌و گواستنەوەی وزەو بەخشینی مۆڵەتەکانی دروست کردن کە لە سنووری کاتالونیا ئەنجام دەدرێن، هەروەها ئەنجام دانی چالاکیەکانی چاودێری‌و پشکنین‌و کۆنترۆڵ کردنی تێکڕای ئەو دامەزراوانە کە لە کاتالونیا دایە.

٢-ڕێکخستنی کارەکانی دابەش کردنی ئەو وزەیە کە لە کاتالونیادا ئەنجام دەدرێن.

٣- دانانی ڕێساکانی جۆری خزمەتگوزاریەکانی دابین کردنی وزە.

٤-پشتگیری و ئیدارەکردنی وزە نۆژەنکراوەکان‌و توانایی وزەییان.

٥-ڕێکخستنی چالاکی دابەش کردن‌و دانانی نیزامی ئابووری لەسەر کەرەستەی وزە تازەکان.

٦- دیاری کردنی ئاژانسی دابەشکردنی کارەبایی.

٢) ئەنجوومەنی گشتی لەڕێگای بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتێکی تایبەتمەندو لە چوارچێوەی ڕێوشوێنی گونجاودا مۆڵەت بە دامەزراوەکانی بەرهەمهێنان‌و گواستنەوەی وزە دەبەخشێت کە لە سنووری کاتالونیا تێدەپەڕێت.

٣) ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە رێکخراوەکانی حکومەتی ناوەندی، ئەوانەی کە بە ئەرکی رێکخستنی کەرتی وزەو پلان دانان هەڵدەستن لە سنووری کاتالونیادا.

٤) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری دانانی نیزامی تایبەت بۆ کانگاکان بەگوێرەی پرنسیپەکانی تەشریعی ئەساسی دەوڵەت، ئەم دەسەڵاتە بریتییە لە رێکخستنو دانانی چاودێری ئیداریو کۆنترۆڵ کردنی کانگاکانو ئەو سەرچاوانە کە لە کاتالونیادایە.

**ماددەی (١٣٤)**

## وەرزشو کاتی دەست بەتاڵی

١) بابەتی وەرزش لە دەسەڵاتی تایبەتمەندی ئەنجوومەنی گشتی دایەو بریتییە لە:

١. پشتگیری کردن، پلان دانان هەماهەنگی کردن، راپەڕاندن، راوێژکردنو پیشاندانی پراکتیکی چالاکی جستەییو هەر وەرزشێکی دی کە لە کاتالونیادا ئەنجام دەدرێت.

٢. پشتیوان کردنی لە چالاکیە وەرزشیەکانی کاتالانو یارمەتی دانی فیدراسیۆنە کاتالانیەکان بە مەبەستی بەشداری کردن لەو پێشبڕکیە فەرمیانە کە لە ئاستی ئەورووپیو نێودەوڵەتی دایە لەڕێگای هەڵبژاردنەکانی وەرزشی نیشتمانی.

٣. ڕێکخستنی ئۆرگانەکانی یاسایی‌و ناوبژیوانی لە بواری وەرزشیدا.

٤. ڕێکخستنی کاروباری پێکهاتەی وەرزشی‌و پشتگیری کردنی بواری تەکنیکی‌و بوارەکانی دی وەرزش.

٥. دانانی نیزامی یاسایی فیدراسیۆن‌و یانە وەرزشیەکان‌و ئەو سەنتەرانە کەلە بواری پراکتیکی وەرزش‌و چالاکی جەستەیی لە سنووری کاتالونیا ڕێك دەخرێن.

٦. ڕێکخستنی بواری دیسپلینی وەرزشی، پێشبڕکێ‌و هەڵبژاردنی ئەو سەنتەرانە کە پراکتیکی وەرزش ڕێك دەخەن.

٧. پشتگیری‌و هاندانی کۆمەڵەو یانە وەرزشیەکان.

٨. تۆمارکردنی ئەو کۆمەڵەو سەنتەرانە کە ئەرکی پراکتیکی وەرزشی‌و چالاکی جەستەیی ئەنجام دەدەن لە کاتالونیا.

٩. پلان دانان‌و ڕێکخستنی تۆڕی تیپە وەرزشیەکانی کاتالونیا.

١٠. ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە سەنتەرو ئۆرگانەکانی بواری دەوڵەت‌و ئەورووپاو نێودەوڵەتی کە ئامانجیان پەرەپێدانی وەرزشییە.

١١. چاودێری کردنی بواری تەندروستی- وەرزشی پەیڕەوکەرانی چالاکی جەستەیی‌و وەرزشی.

١٢. ڕێکخستن‌و کۆنترۆڵ کردنی دیاردەی توندوتیژی لە بواری وەرزشی‌و چالاکی جەستەیی.

١٣. زامن کردنی تەندروستی بینەرانو ئەوانەی کە لە بواری ڕێکخستنو مارەسەکردنی چالاکی جەستەیی وەرزش کاردەکەن، هەروەها کۆنترۆڵ کردنی بواری تەندروستی تیپە وەرزشیەکان.

١٤. پەرەپێدان بە توێژینەوەی زانستی لە بواری وەرزش.

٢) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری پەروەردەیی جەستەییو وەرزشی بە گوێرەی پرنسیپەکانی تەشریعی ئەساسی دەوڵەت.

٣) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری کاتی دەست بەتاڵی کە پێك دێت لە پشتگیری کردنو ڕێکخستنی ئەو چالاکیانە کە لە کاتالونیا ئەنجام دەدرێن، هەروەها دانانی نیزامی یاسایی بۆ سەنتەرو ئەو کۆمەڵانە کە ئامانجیان ڕاپەراندنی چالاکیەکانی کاتی دەست بەتاڵیە.

٤) ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە سەنتەرو نۆرگانەکانی دەوڵەتو ئەوروپاو نێودەوڵەتی کە ئامانجیان پەرەپێدانی بوارەکانی دەست بەتاڵیە.

## ماددەی ( ١٣٥ )

## سەرژمێریی و ئامارکردن

١) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری سەرژمێریو ئامارکردن کە لە کاتالونیادا ئەنجام دەدرێن وەکو:

١- پلان ڕێژی لە بواری سەرژمێرکردن.

٢- ڕێکخستنی ئیداری.

٣- دانانی سیستەمێکی سەرژمێریی فەرمی تایبەت بە کاتالونیا.

٢) ئەنجوومەنی گشتی بەشداریو هاوکاری دەکات لە ئامادەکاری بۆ سەرژمێریی لە ئاستی ئۆتۆنۆمیەکاندا.

## ماددەی ( ١٣٦ )

## وەزیفەی گشتی و میلاکاتی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان.

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لەسەر وەزیفە گشتییەکان بەپێی پرنسیپی ئۆتۆنۆمی ناوچەیی.

أ دانانی نیزامی یاسایی ئەو میلاکاتانە کە لە بواری ئیدارە گشتییەکانی کاتالان کار دەکەن.

ب دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر وەرگرتنی میلاکاتو لەدەستدانی مەرجەکانی وەرگرتنی ئیدارە گشتییەکانو مافو ەرکە سەرەکیەکانیان.

ج- دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر میلاکاتی کارگوزاریو پەیوەندیەکانی کارو پێداویستیەکانی رێکخستنی ئیداریو پێکهاتەی ئەو میلاکاتە.

**ماددەی (١٣٧)**

## نیشتەجێبوون

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری نیشتەجێبوونو نیشینگە کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

١- پلان دانانو بەڕێوەبردنو رێکخستنو پشکنینو کۆنترۆڵ کردنی بوارەکانی نیشتەجێبوون بەگوێرەی پێداویستیە کۆمەڵایەتیەکان و هاوسەنگیو یەکسانی هەرێمایەتی.

٢- دانانی تەشریعی مەدەنی لەسەر خاوەندارێتی ناسۆییو کرێی عەقارات و شارستانی و تایبەتمەندییەکانی جوڵانەوەی عقارات لەچوارچێوەی ئەحکامەکانی ماددەی (١٢٣)دا.

٣- رەچاوکردنی ئەولەویاتو ئامانجەکانی چالاکیەکانی ئیدارە گشتییەکانی کاتالونیا لە بواری نیشتەجێبوونو گرتنەبەری رێوشوێنی شیاو بۆ ئەو مەبەستە.

٤- پشتیوانی کردنی حکومەت لە بواری نیشتەجێبوون.

٥- ڕێکخستنی کاروباری ئەو بازرگانیانە کە پەیوەندییان بە بواری نیشتەجێبوون و نشینگەوە هەیە لەگەڵ ڕاگرتنی سەلامەتی ئەو بوارە.

٦- نوێکردنەوەی تەکنەلۆژیاو سەقامگیری لە بواری نیشتەجێبووندا .

٧- دانانی ڕێسای گونجاو بۆ دروستی نیشینگەکان.

٨- پشتیوانی کردنی مانەوەو بەردەوام بوونی پرۆسەی کاروبارەکانی نیشتەجێبوون.

٩- دانانی مەرجەکانی تەلارسازیی و دروست کردنی ژێرخانی گشتی و ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی تەل و بێ تەل و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و تەلەفۆن و خزمەتگوزارییەکانی کێبڵ.

## ماددەی ( ١٣٨ )

## کۆچبەریی

١) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری دانانی نیزامی وەرگرتنی کەسی کۆچبەرو تێکەڵاوکردنی بە کۆمەڵ، لەهەموو حاڵەتێکدا ئەو دەسەڵاتە بریتییە لە:

أ- دانانو رێکخستنی گەرەنتیەکانی مافو ئەرکەکانی کەسانی کۆچبەر.

ب- گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست بۆ پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابووری کەسانی کۆچبەرو بەشداری بوونیان لە کاروبارە گشتییەکان.

ج- دانانی چوارچێوەیەکی دیاریکراو بۆ پێشوازی کردنو قەبوڵ کردنی کەسانی کۆچبەر بەپێی یاسا.

د- هاندانو پشتگیری کردنی کۆچبەرانی گەڕاوەو یارمەتیدانیانو دانانی سیاسەتی شیاو وئاسانکاری کردن بۆ گەڕانەوەیان.

٢) ئەنجوومەنی گشتی دەسەلاتی هەیە تەشریعات دەربکات لە ئاستی دەوڵەتو ئەورووپادا لە بواری کارکردنی بیانییەکان،

ئەم دەسەڵاتە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- بەخشینی مۆڵەتو دانی ئیجازەی کارکردن.

ب-ڕێکخستنی مەرجەکانی کارکردنی بیانیەکانو پەیڕەوکردنی نیزامی پشکنینو سزادان.

٣) لە چوارچێوەی لیژنەی دوو قۆلی ئەنجوومەنی گشتی- دەولەت پێویستە ئەمانەی خوارەوە دیاری بکرێت:

أ- ژمارەو شوێنو نەسڵو توانایی پیشەیی پشکی کەسانی کۆچبەر بۆ کاتالونیا، بەپێی پێداویستیەکانو پێشینیەکانی کارو پێشکەوتنی ئابووری.

ب- بڕیارەکانی ناوەندی دەربارەی کۆچبەریی، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە بیانیەکانەوە هەیە بەگوێرەی ڕێکەوتنامە نێودەولەتیەکانو ئەو فەرمانە حکومەتیانەکان کە تایبەتە بە کاتالونیا.

**ماددەی (١٣٩)**

## پیشەسازی، کاری دەستی، کۆنترۆڵ کردنی کێشەکانو پشکنینی زیوو زێڕ.

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەلاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری پیشەسازیە بێ زیان گەیاندن بە ئەحکامەکانی بڕگەی (٢).

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەلاتی هاوبەشی هەیە لەبابەتی پلاندانان لە بواری پیشەسازی بە گوێرەی ئەو پرنسیپانە کە دەولەت داینـاوە لە بواری پلان دانانی ئابووری گشتی.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بابەتی کاری دەستی کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- ڕێکخستن‌و گرتنەبەری ڕێوشوێنی نیداری بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارانە کە پەیوەندیان بە کارگەکان‌و کاری دەستیەوە هەیە.

ب-گرتنەبەری ڕێوشوێنی پشتگیری کردنی بواری پێشبڕکێ‌و تواناو پێشکەوتنی کارگەکانی کاری دەستی‌و پشتگیری کردنی بەرهەمەکانیان‌و دروست کردنی کەناڵەکانی بازرگانی پێ کردن.

٤- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری کۆنترۆڵ کردنی پێوەرو کێشانەکان.

٥- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لەسەر پشکنینی زیو و زێڕ بەگوێرەی پێوەرەکانی زانستی‌و پیشەیی.

## ماددەی (١٤٥)

## ژێرخانی گواستنەوەو گەیاندن

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بابەتی بەندەرو فڕۆکەخانەکان‌و ئەو ژێرخانەی گواستنەوە کە لە کاتالونیادایەو بەگوێرەی یاسای دەوڵەتی مەرکەزی لەچوارچێوەی بەرژەوەندیەکانی گشتی نەژمێردراون.

ئەم دەسەڵاتانەش لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ-نیزامی یاسایی‌و پلان دانان‌و بەڕێوەبردنی سەرجەم بەندەرو فڕۆکەخانەو دامەزراوەکانی بەندەرو فڕۆکەخانەکان.

ب-کۆنترۆڵ کردنی گشتی پێویست بۆ پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکان.

ج- نیزامی ئابووری خزمەتگوزاریەکانی بەندەرو فڕۆکەخانەکان بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە گومرگ‌و باجەکانەوە هەیە.

د- دیاری کردنی ناوچەی خزمەتگوزاریەکانی بەندەرو فڕۆکەخانەکان.

٢- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لەو ئۆرگانە ناوچە ئۆتۆنۆمیانە کە لە سنووری کاتالونیا ئەرکی ژێرخانی گواستنەوە ئەنجام دەدەن‌و لە دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی دایە.

٣- هەر پڕۆژەیەکی دروست کردنی بەندەر یان فڕۆکەخانە لە سنووری کاتالونیا کە لە بەرژەوەندی گشتیدا بێت پێویستی بە دانوستانی پێشوەخت هەیە لە لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت.

٤- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە نەخشەکێشانی پڕۆگرامەکانی بەندەرو فڕۆکەخانەکانی بەرژەوەندی گشتی.

٥- بەندەری بەرشلۆنەو بەندەری تاراگۆنا نیزامێكی تایبەتی دەبێت بۆ بەڕێوەبردنی كارەكانی، كە پێویستە ئەنجوومەنی گشتیو دەوڵەت لەسەری رێك بكەون لەسەر پێشنیاری لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت.

٦- پێویستە كاروباری رێكخستنو نیزامی یاسایی بەندەری بەرشلۆنەو تاراگۆن بە یاسایەكی پەرلەمان دیاری بكرێت.

٧- فرۆكەخانەی بەرشلۆنە نیزامێكی تایبەتی خۆی دەبێت بۆ راپەڕاندنی ئەركەكانی كە پێویستە ئەنجوومەنی گشتیو دەوڵەت لەسەر رێك بكەون لەسەری پێشنیاری لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت.

٨- پێویستە كاروباری رێكخستنو نیزامی یاساییو ئابووری فرۆكەخانەی بەرشلۆنە بە یاسایی پەرلەمان دیاری بكرێت لە چوارچێوەی پرنسیپە سەرەكیەكانی تەشریعی دەوڵەت.

٩- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری تۆڕی گواستنەوە لەچوارچێوەی سنووری هەرێمایەتی كاتالونیا، كە پێكهاتووە لە رێگاویانو تونێلەكانو جادە دوو سایدەكانو رێگاوبانەكانی دی.

١٠- لە حاڵەتی هەر دەستکاریی پلان بەرفراوان کردن یان گۆڕانکارییەک لە تیرامی ئابووری و دارایی، پێویستە پێشوەخت ڕای ئەنجومەنی گشتی وەربگیرێت.

١١- ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە بواری هێڵەکانی تەلسی و ژێرخان و بەشداری کردن لە پلان دانان و ئیدارە کردنی ئەو ژێرخانە کە لە سنووری کاتالۆنیا دان و سەر بە ئیدارەی حکومەتی ناوەندین.

١٢- ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری پەیوەندییەکانی ئەلیکترۆنی.

١٣- ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە بواری فەزایی رادیۆی ئەلکترۆنی لە چوارچێوەی نەخشەکانی دەوڵەتدا.

**مادەی (١٤١)**

## یاری و دیمەنەکان

١- ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری یاری و یانەو گەڕینۆکانی کات بەسەر بردن کە بریتییە لە:

أ- دامەزراندن و مۆڵەت پێدانی جێگاکانی یاری کردن و شوێنەکانی گرەو لە چوارچێوەی یانەکاندا.

ب- ڕێکخستن و کۆنترۆڵ کردنی ئەو شوێن و جێگایانەی کە تێیدا ئەو چالاکییانە ئەنجام دەدرێن.

ج- دیاری کردنی نیزامی دارایی و باجەکان لەسەر چالاکیەکانی ئەو کۆمپانیانە کە بەو کارە هەڵدەستن.

٢- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە سوودەو قازانجی ئەو گرەو یاریانە کە سەر بە دەوڵەتن لە سنووری کانتۆنیا ئەنجام دەدرێن بەگوێرەی ئەو پێوەرانە کە لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت دیاری دەکات.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری دیمەن و چالاکیەکانی کات بەسەربردن کە بریتییە لە ڕێکخستنی گشتی ئەو کەرتەو نیزامی ئیداری و ئاسایش و کۆنترۆڵ کردنی ئەو دیمەنانە لە شوێن و جێگا گشتییەکان.

**ماددەی (١٤٢)**

## گەنجان

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری لاوان و گەنجاندا، کە بریتییە لە تێکڕای ئەو سیاسەتە کە کار لە ژیانی گەنجان دەکات وەکو:

أ- دانانی نەخشەو پلان و پرۆگرام و نرخاندنی ئەو سیاسەتە کە بۆ گەنجان تەرخان دەکرێت.

ب- پشتگیری کردنی کۆمەڵەو سەنتەرو ڕێکخراو چالاکیانە کە گەنجان تیایدا بەشداری دەکەن.

ت- ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئیداری و چالاکی ئەو دامەزراوانە کە بۆ گەنجان تەرخان کراون.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لەسەر مۆرکردنی ڕێککەوتننامە لەگەڵ کیانە نێودەوڵەتییەکان و بەشداری کردن لە چالاکیەکانیان بە هاوکاری دەوڵەت یان بەشێوەی سەربەخۆ.

## ماددەی (١٤٣)

## زمانی تایبەتی

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری زمانی تایبەت کە بریتییە لە دیاری کردنی حاڵەتەکانی بەکارهێنان و کاریگەری یاسایی و ڕێوشوێنی دوو قۆڵی و زمانی تایبەتی و ئاسایی کردنەوەی زمانی کاتالان.

٢- ئەنجوومەنی گشتی و ئەنجوومەنی دوو قۆڵی دۆڵی ئاران دەسەڵاتی هەیە لە ئاسایی کردنەوەی زمانی ئارانی لە ناوچەی دۆڵی ئاران.

## ماددەی (١٤٤)

## ژینگەو فەزای سروشتی و کەش و هەوا

١) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری ژینگە بەگوێرەی پرنسیپە سەرەکیەکانی تەشریعی سەرەکی دەوڵەت ئەو دەسەڵاتە هاوبەشە بریتییە لە:

١- ڕێکخستنو دانانی ئامرازەکانی نەخشەکێشانی ژینگە.

٢- دانانی پلانو پرۆگرامەکان لە بواری ژینگەدا.

٣- دانانی ڕێوشوێنەکانی سەقامگیری ژینگەو توێژینەوەی ژینگەیی.

٤- ڕێکخستنی سەرچاوەکانی سروشتیو شوێنە ڕووەکیو ئاژەڵیەکانو پاراستنی ژینگەی دەریاو رووبارەکان.

٥- ڕێکخستنو پاراستنی بەرهەمەکانی قوتوبەندی لە هەموو قۆناغەکانی دروست کردنیدا تا ئەو کاتەی دەبێتە پاشماوە.

٦- خۆپاراستن لە پاشماوەکان کە لە سنووری کاتالونیا دایە.

٧- پاراستنی زەویو ژێرزەوی لە پیس بوون.

٨- پاراستنی لێوارەکانی کاتالونیا لەهەر جۆرە پیس بوونێك.

٩- پاراستنی ژینگەی ناوهەواو پاراستنی لە هەموو جۆرە پیس بوونێك.

١٠- پشتگیری کردنی چالاکیەکانی دامەزراوە ژینگەیەکان.

١١- چاك کردنەوەی ئەو زیانانە کە بەر ژینگە دەکەوێتو دانانی نیزامی یاسایی بۆیان.

٢) ئەنجوومەنی گشتی لە بواری شوێنە سروشتیەکان دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە.

٣) ئەنجوومەنی گشتی لە حاڵەتی ئەو شوێنە سروشتیانە کە لە سنووری کاتالونیا تێدەپەڕێت، پێویستە بەگوێرەی ماددەی (١١٥) بە پشتیوانی ئامرازەکان هاوکاری بکات لەگەڵ کۆمەڵگە ئۆتۆنۆمیەکانی دی بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکان.

٤) ئەو شوێنە سروشتیانە کە نیزامێکی پاراستنیان هەیە لە لایەن دەوڵەتەوە، پێویستە ڕەزامەندی پێشوەختی لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت وەربگیرێت تا بکەوێتە نێو سنووری دەسەڵاتەکانی کاتالونیا.

٥) ئەنجوومەنی گشتی لە بواری کەش و هەواو کەشناسی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە بۆ پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکانی کەشناسی لە کاتالونیا.

٦) ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لەو دەستە نێودەوڵەتیانە کە ممارەسەی ئەرکەکانی کەش و هەواو کەشناسی دەکەن بە هاوکاری دەوڵەت یان بەشێوەی ڕاستەوخۆ بۆ پارێزگاری کردنی ژینگە.

٧) ئەنجوومەنی گشتی سەلاحیاتەکانی لەم بوارەدا لەڕێگای "دەستەی ئاژانسی گوندەکانەوە" ممارەسە دەکات. ئەندامانی ئەم دەستەیە بریکاری دەسەڵاتن و ممارەسەی ئەرکەکانی پۆلیسی ئیداری تایبەت و پۆلیسی دادوەری دەکەن.

**ماددەی ( ١٤٥ )**

## بازاڕی گران بەهاکان و سەنتەرەکانی گرێبەندی

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بابەتی بازاڕە گران بەهاکانو ئەو سەنتەرە گرێبەندانە کە لە سنووری کاتالونیادایە، بەگوێرەی ئەو پرنسیپو یاسایانە کە بۆ ئەم بوارە رێك خراون.

**ماددەی ( ١٤٦ )**

## هۆکارەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتیو خزمەتگوزاریەکانی هۆکارەکانی بینراو بیستراو

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە بواری پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکانی رادیۆو تەلەفزیۆنو هەر هۆکارێکی دی بینراو بیستراو لە کاتالونیا.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر رێکخستنو کۆنترۆڵ کردنی هۆکارەکانی بینراو بیستراو هەر هۆکارێکی دی کە ئەو تەکنەلۆژیایە بەکاردەهێنێتو ئارستەی رای گشتی دەکات لە کاتالونیا.

٣- ئەنجوومەنی گشتی بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداری دەکات لەو پرۆسە کارگێریانە کە پەیوەندیان بە پێشکەش کردنی

خزمەتگوزاری هۆکارەکانی بیستراو بینراو هەیەو لە دەسەلاتی دەوڵەت دایە.

**ماددەی (١٤٧)**

## دادنووسی و تۆمارەکانی گشتی

١- ئەنجوومەنی گشتی سەلاحیاتی هەیە لەبابەتی دادنووسی و تۆمارە گشتییەکانی مۆلکداریتی و بازرگانی. ئەم دەسەلاتە جێبەجێکارە، لەهەموو حاڵەتەکاندا، بریتییە لە:

أ- دامەزراندنی دادنووسان و تۆمارکەرانی مۆلکداریتی و بازرگانی.

ب- پشکنینی بەڵگەنامەو تۆمارەکان و ڕێکخستنی کارەکانیان.

ت- دانانی نیشانەو مارکە لەسەر دەفتەرو تۆمارەکان.

پ- ڕێکخستنی کاروباری تایبەتمەندیتی گومرگی ئەم کەرتە.

٢- ئەنجوومەنی گشتی لە بواری دادنووسی و تۆمارە گشتییەکان دەسەلاتی هەیە لە پرۆتۆکۆڵ و دەفتەرەکانی تۆماری مۆلکداریتی و تۆماری خانووبەرەو کەلوپەلی نەگوێزراوەو بازرگانی مەدەنی لە کاتالونیا.

٣- ئەنجوومەنی گشتی سەلاحیاتی جێبەجێکاری هەیە لە بواری "تۆماری مەدەنی" کە بریتییە لە دامەزراندنی راسپێردراوەکان و لادانیان، هەروەها ئەنجامدانی ئەرکی دیسپلینی هاتنی

هۆکارەکانی ماددیو مەعنەوی پێویست بۆ راپەڕاندنی کارەکانیان.
ئەو راسپێردراوانە پێویستە زمانو مافەکانی کەتەلانیەکان بزانن بەو شێوەو جۆرە کە یاسای بنەڕەتیو یاساکان دیاریيان کردووە.

**ماددەی ( ١٤٨ )**

## کارە گشتییەکان

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری ئەو کارە گشتیانە کە لە کاتالۆنیا ئەنجام دەدرێنو لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گشتی نەژمێردراونو کار ناکەنە سەر کۆمەڵگایەکی ئۆتۆنۆمی دی.

٢- وەسف کردنی ئەو کارە گشتیانە کە لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گشتی دایەو پێویستی بە پەسنکردنو راپۆرتی پێشوەختی لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت هەیە.

**ماددەی ( ١٤٩ )**

## رێکخستنی کاروباری ناوچەو دیمەنو کەنارو ئاوادان کردنەوە

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە بواری رێکخستنی کاروباری ناوچەو دیمەنو کەنارەکان لە چوارچێوەی یاسای پەیوەندیدارەدا.

٢- دیاری کردنی ڕێوشوێنە تایبەتیەکانی پشتگیری کردن و هاوسەنگی ناوچەکان و باری دیوگرافی و سوسیو- ئابووری و ژینگەیی.

٣- دیاری کردنی ئێرخان و ئەو کەرەستە و ئامێرانە دەوڵەت کە لە کاتالۆنیا هاییە بە ڕاپۆرتی پێشوەختی لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت.

٤- چاودێری کردنی کەنار و لێوارەکانی کاتالۆنیا.

٥- ڕاپەڕاندنی ئەو ئیش و کارانەی بەرژەوەندی گشتی کە دەکەوێتە سەر کەنارەکانی کاتالان بەپێی ماددەی (١٤٨).

٦- ئەنجوومەنی گشتی لە بواری نیشتەجێبوون و ئاوەدان کردنەوە دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە سەبارەت بە پلان دانان و بەڕێوەبردنی کارەکانی ئەم بوارە.

٧- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر داماڵینی مۆڵەت و قەرەبووکردنەوەی خاوەنەکانیان.

**ماددەی (١٥٠)**

## ڕێکخستنی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان

ئەنجوومەنی گشتی، لە بوازی ڕێکخستنی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان، بەگوێرەی پرنسیپی ئۆتۆنۆمی ناوخۆیی، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر:

أ- نەخشەکێشان‌و ڕێکخستنی نۆرگانەکان‌و دانانی ڕێنمایە گشتییەکان‌و بەڕێوەبردنی هەموو ناوچە هەرێمایەتیەکان.

ب- شێوە جیاجیاکانی ڕێکخراوەیی بۆ کاروباری ئیداری‌و ڕێکخستنی شێوەکانی میلاکاتی گشتی‌و تایبەتی.

**ماددەی ( ١٥١ )**

## ڕێکخستنی هەرێمەکان

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری ڕێکخستنی هەرێمەکان‌و دانیشتووانی کیانە ناوچەیەکان، کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- دامەزراندن‌و دەستکاری کردن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو کیانانە کە لە چوارچێوەی ڕێکخستنی هەرێمایەتی کاتالونیادایە.

ب- هەڵوەشاندنەوەو گۆڕینی ناوو قەوارەکانی چ لە ئاستی شارەوانیەکان‌و چ لە کیانە ناوچەییەکان.

ج- دانانی ڕێوشوێنەکانی پەیوەندی لەنێوان کیانە ناوخۆییەکان‌و دانیشتووان.

**ماددەی (١٥٢)**

## نەخشەکێشان و ڕێکخستن و پشتگیری کردنی چالاکی ئابووری

١) ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت نەخشە بۆ چالاکی ئابووری دابنێت لە چوارچێوەی ئەو ڕێنمایانە کە نەخشەی گشتی دەوڵەت دیاری کردووە.

٢) پەرەپێدان و بەڕێوەبردنی نەخشەی گشتی چالاکی ئابووری دەکەوێتە ئەستۆی ئەنجوومەنی گشتی لەڕێگای لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت.

٣) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر ڕێکخستنی کاروبارو چالاکی ئابووری.

**ماددەی (١٥٣)**

## سیاسەتەکانی ڕەگەز

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری سیاسەتەکانی ڕەگەز کە بریتییە لە:

أ- نەخشەکێشان و ڕاپەڕاندنی ئەو پلان و ڕێنمایانە کە لە چوارچێوەی ئەو سیاسەتە بۆ پاراستنی ئافرەتان دادەنرێت، وەکو دانانی هۆکارەکانی ئیجابی بۆ نەهێشتنی جیاکاری لەبەر هۆی ڕەگەز کە پێویستە لە سەرتاپای خاکی کاتالونیا بە یەکسانی جێبەجێبکرێت.

ب- پشتگیری کردنی ئەو رێکخراوانەی ژنان کە بە ئەرکی ئەنجامدانی چالاکیەکانی یەکسانیو هاوکاریو بەشداری کردنی ژنان هەڵدەستێ.

ت- رێکخستنی رێوشوێنەکانو دابین کردنی ئامرازەکانی هۆشیارکردنەوە لە دژی بەکارهێنانی توندوتیژی دژی رەگەزی مێینە. یارمەتی دانی ئەو ژنانە کە بوونەتە ئامانجی کردەوەکانی توندوتیژی.

پ- نرخاندنو کۆنترۆڵ کردنی ئەو سیاسەتە کە بۆ ئەم بوارە دادەنرێت.

**ماددەی (١٥٤)**

## پشتگیریو بەرگری کردن لە کێبڕکێیەکان

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری پشتیوانی کردن لە پێشبڕکێیەکانی ئابووری کە لە کاتالونیا ئەنجام دەدرێن.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری بەرگری کردن لەو پێشبڕکێیانە کە ئامانجی چالاکیە ئابووریەکانیان پەرە بە بازاڕی ئازاد دەدات لە سنووری کاتالونیا.

٣- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لەو ئۆرگانانە کە لە ئاستی ئیسپانیاو ئەوروپا دا ئامانجیان پشتیوانیو بەرگری کردنە لە بواری پێشبڕکێ.

٤- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری دانانو ڕێکخستنی کاروباری "دادگای کاتالان بۆ داکۆکی کردن لە پێشبڕکێ" وەکو ئۆرگانێکی تەشریعی سەربەخۆ لە سنووری کاتالونیا، کە ئەرکی ڕێکخستنی چالاکیە ئابووریەکانە لە کاتالونیا.

## ماددەی (١٥٥)

## موڵکایەتی هزرو پیشەسازیو داهێنان

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی هەیە لە بواری موڵکایەتی هزر کە بریتییە لە:

أ- دانانی تۆمارێك بۆ مافەکانی مۆڵکایەتی هزر لە سنووری کاتالونیا. ئەنجوومەنی گشتی پێویستە دەوڵەت ئاگاداربکاتەوە لەو سپاردنو تۆمارانە کە ئەنجام دەدرێن تا بخرێنە نێو تۆمارەکانی دەوڵەتەوە، پێویستە لەم بابەتە هاوکاری بکات بۆ ئاڵوگۆڕکردنی داتاو زانیاریەکان.

ب- مۆڵەت پێدانو هەڵوەشاندنەوەی ئەو کیانو سەنتەرانە کە بەشێوەی جەماعی بە زۆری چالاکیە هزریەکان لە کاتالونیا ئەنجام دەدەن.

ت- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی راپەڕاندنی هەیە لە بوارەکانی موڵکایەتی پیشەسازیو رێکخستنی ئەم بوارە لە چوارچێوەی سنووری خۆیدا.

**ماددەی (١٥٦)**

## پاراستنی داتا کەسایەتیەکان

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکاری لە بواری پاراستنی زانیارە کەسایەتیەکانی هەیە کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- رێکخستنو تۆمارکردنو کۆنترۆڵ کردنی فیشە کەسایەتیەکان کە تایبەتە بەو زانیاریانە کە مۆرکی کەسایەتی پێوەیەو لەلایەن دامەزراوە گشتییەکانی کاتالونیا، ئیدارەی کاتالونیا، ئیدارە خۆجێیەکانی کاتالونیا، کیانە ئۆتۆنۆمیەکانو تێکڕای کیانەکانی دی مافی گشتی یان تایبەتی پێشکەش دەکرێن یان بەڕێوە دەبرێن.

ب- رێکخستنو تۆمارکردنو کۆنترۆڵ کردنی ئەو فیشە کەسایەتیە کە لەلایەن کەسایەتی سروشتی یان یاساییەوە بەڕێوە دەبرێن لە

چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی یان کیانە لۆکاڵەکانی کاتالونیا ئەگەر چالاکیەکان لە کاتالونیادا ئەنجام بدرێن.

ت- دامەزراندنی دەسەڵاتێکی سەربەخۆ کە لەلایەن پەرلەمانەوە دەستنیشان کرابێتو شەونخونی بکات لەپێناو زامن کردنی مافی پاراستنی داتانە کەسایەتیەکان لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی.

**ماددەی ( ١٥٧ )**

## ڕێکلام

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بابەتی ڕێکخستنی چالاکی ڕێکلامەکان ئەویش بە یاسا ڕێك دەخرێت.

**ماددەی ( ١٥٨ )**

## توێژینەوەو پێشکەوتنو نوێکردنەوەی تەکنەلۆژیا

١- ئەنجوومەنی گشتی لە بابەتی توێژینەوەی زانستیو تەکنیکی، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر سەنتەرو ناوەندەکانی توێژینەوەو پالپشتی و یارمەتی دارایی بۆ تەرخان دەکات کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- دانانی هێڵە تایبەتیەکانی توێژینەوەو بەدواداچوونو کۆنترۆڵی کردنو نرخاندنی پرۆژەکان.

ب- رێکخستنو دانانی نیزامی بەڕێوەبردنو کۆنترۆڵ کردنی ئەو سەنتەرە تایبەتیانە کە لە کاتالونیا نیشتەجێن.

ج- هەماهەنگی کردنی سەنتەرو ستراکتەرەکانی توێژینەوەی کاتالونیا.

د- رێکخستنو چاودێریی کردنی ئەو زەماڵەو یارمەتیانە کە تەرخان کراون بۆ سەنتەرو پرۆژەکانی لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی کاتالونیا.

هـ- بڵاوکردنەوەی زانستو گواستنەوەی ئەنجامەکانی.

**ماددەی (١٥٩)**

## نیزامی یاسایی، رێوشوێنەکان، گرێبەندیی، داماڵینیی موڵکایەتیو بەرپرسیارێتی لە ئیدارە گشتییەکانی کاتالان.

١. ئەنجوومەنی گشتی ، لە بواری دانانی نیزامی یاساییو رێوشوێنەکانی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە:

أ- پەیداکردنی هۆکاری پێویست بۆ ممارەسەکردنی ئەرکە ئیدارییەکان.

ب- دەسەڵاتی کۆنترۆڵ، پشکنینو سزا لەسەر سەرجەم بوارە ماددیەکانی دەسەڵاتی ئەنجوومەنی گشتی.

٢. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە بواری داتانی نیزامی یاسایی‌و ڕێوشوێنی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان کە لە بڕگەی (١)دا ئاماژەی پێ کراوە، دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە، بەگوێرەی پرنسیپەکانی تەشریعی ئەساسی دەوڵەت، لەسەر نیزامی یاسایی ئیدارە گشتییەکان‌و ڕێوشوێنەکانی ئیدارەی هاوبەش بۆ زامن کردنی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان.

٣. ئەنجوومەنی گشتی سەبارەت بە گرێبەستەکانی ئیدارە گشتییەکانی کاتالونیا دەسەڵاتی هەیە:

أ- دەسەڵاتی تایبەتمەندی لە بواری ڕێکخستن‌و دەسەڵاتەکان لە بواری گرێبەستی ئۆرگانەکانی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان‌و لەسەر ئیجرائاتی جێبەجێکردن‌و دەستکاری‌و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکانی ئیدارە هەیە، تەنیا ماف‌و ئەرکەکانی لایەنەکانی گرێبەستەکان نەبێت.

ب- دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر سەرجەم ئەو بوارانە کە لە بڕگەی (أ) دا نەهاتووە، لە چوارچێوەی پرنسیپە سەرەکیەکانی تەشریعی ئەساسی دەوڵەت تایبەت بە گرێبەستەکان.

٤- لە بواری داماڵینی موڵکدارێتی کە ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە.

## ماددەی (١٦٠)

## نیزامی لۆکال (ناوچەیی-و-)

١) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری دانانی نیزامی لۆکال کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- پەیوەندیەکان لەنێوان دامەزراوەکانی ئەنجوومەنی گشتیو کیانە لۆکالیەکان، هەروەها تەکنیکەکانی ڕێکخستنو پەیوەندی لە پێناو هاوکاریو کۆمەك کردن لەنێوان کیانە لۆکالیەکانو لەنێوان ئەمانەو ئیدارەی گشتی ئەنجوومەنی گشتی، کە تێکڕایی شێوە جیاجیاکانی هاوکاریو یارمەتی دانو کۆمەك دەگرێتەوە.

ب- دیاری کردنی دەسەڵاتەکانو دەسەڵاتە تایبەتیەکانی شارەوانیەکانو تێکڕای کیانە لۆکالیەکان لەبوارەکانی پسپۆرایەتی کە لە ماددەی (٨٤)دا دیاری کراوە.

ت- نیزامی سەرو سامانەکانی موڵکایەتی گشتیو هاوبەشو میراتو شێوە جیاجیاکانی خزمەتگوزاریەکانی گشتی.

پ- دیاری کردنی ئۆرگانەکانی بەڕێوەبردنی کیانە لۆکالیەکان کە لە چوارچێوەی یاسایی بنەڕەتیدا دیاری کراوە.

ج- نیزامی ئۆرگانە تەواو کەرەکانی ڕێکخراوەیی کیانە لۆکالیەکان.

ح- ڕێوشـــوێنەکانی ئامـــادەکردنو پەســـندکردنی یاســـا ناوچەییەکان.

٢) تێکڕای ئەو بابەتانە کە لە بڕگەی (١) دا ناوتاخن نەکراوەو کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی دایە.

٣) ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بواری نیزامی هەڵبژاردنی شارەوانییەکان لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی گشتی ڕاستەوخۆ ودەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری نیزامی هەڵبژاردن لەڕێگای دەنگدانێکی ناڕاستەوخۆ سەبارەت بە تێکڕای کیانە لۆکالییەکان.

مادەی (١٦١)

## پەیوەندییەکان لەگەڵ کیانە ئاینییەکان

١. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری ئەو کیانە ئاینییانە کە چالاکییەکانیان لە کاتالونیا ئەنجام دەدەن، کە بریتییە لە ڕێکخستنو دانانی میکانیزمی هاوکاریو کۆمەك بۆ ئەرەسەکردنی چالاکییەکانیان لە چوارچێوەی سەلاحیاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی.

٢. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لە بابەتی ئازادی ئاینی. لە ئەرەسەکردنی ئەم دەسەڵاتە ڕەچاوی پێشکەوتنی

ڕاستەوخۆی فاکتەرە سەرەکییەکانی یاسا دەکاتەو لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- تۆمارکردنی کیلگە ئایینییەکان سەبارەت بە کڵێساو شوێنە ئایینیەکانی سێکتەو کۆمەڵگا ئایینییەکان کە چالاکییەکانیان لە کاتالونیا بەڕێوە دەبەن. پێویستە ئەنجومەنی گشتی، دەوڵەت ئاگادار بکاتەوە لەو تۆمارانە کە لە کاتالونیا ئەو نووسین کراون بۆ ئەوەی لە تۆماری دەوڵەتدا بنووسرێن و پێویستە هاوکاری و ئاسانکاری بکەن لە گۆڕینەوەی زانیارییەکان.

ب- سازدانی ڕێکەوتنامەو پەیماننامەکانی هاوکاری لەگەڵ کلێسەکان و شوێنە ئایینیەکان کە تۆمارکراون لە تۆماری کیلگە ئایینیەکانی دەوڵەت لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی گشتیدا.

٣- ئەنجومەنی گشتی بەشداری دەکات لەو ئۆرگانانە کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی دەوڵەت دانراون لە بواری کیانە ئایینیەکاندا ئەرکەکانیان ئەنجام دەدەن.

**ماددەی (١٦٢)**

**تەندروستی و، تەندروستی گشتی و، ڕێکخستنی دەرمانەکان و داودەرمان**

١- ئەنجومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری تەندروستی و تەندروستی گشتی کە پێکهاتووە لە:

أ- ڕێکخستنو بەڕێوەبردنو نرخاندنو پشکنینو کۆنترۆلکردنی سەنتەرەکانو خزمەتگوزاریو دامەزراوە تەندروستیەکان.

ب- ڕێکخستنی دەرمانخانەکان.

٢- ڕێکخستنو نەخشەکێشانو ڕاپەڕاندنی تێکڕای خزمەتگوزاریەکانی تەندروستی گشتیو تەندروستی دەرونی بۆ تێکڕای هاولاتیان.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر دانانی نیزامی یاساییو نیزامی میلاکاتو سیستەمی تەندروستی گشتی.

٤- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات بەشێوەیەکی کاریگەرو لەڕێگای لیژنەی دوو قۆلی ئەنجوومەنی گشتی- دەوڵەت لە دیاری کردنی بناغەو پلانو نەخشەکێشانو هەماهەنگی کردن لە بوارەکانی تەندروستی گشتی.

٥- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لە تەشریعی دەوڵەت لە بواری بەرهەمەکانی داودەرمانو مۆڵەت پێدان بە سەنتەرەکانی ئامادەکردنی بەرهەمەکانی داودەرمانو هەڵبژاردنو تۆمارکردنی پێداویستیەکانی پزیشکی.

**ماددەی (١٦٣)**

**ئاسایشی تایبەتی (ئەهلی)**

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری ئاسایشی تایبەتی کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- ڕێکخستنی ئاسایشی تایبەتیو دانانی نیزامی چاودێری ئیداری لەسەر کۆمپانیاکانی ئاسایشو ئەو میلاکاتانە کە لە کاتالونیا کار دەکەن.

ب- ڕێکخستنو دانانی نیزامی چاودێری ئیداری لەسەر کەسە سروشتیەکان کە ئەرکەکانی ئاسایشو لێکۆڵینەوەی تایبەتی لە کاتالونیا ئەنجام دەدەن.

ج- دابین کردنی پێداویستی و ڕێکخستنی مەرجەکانی دامودەزگاکان ئەو کەسە سروشتی یان یاسایانە کە پێویستە لەسەریان ڕێوشوێنی ئەمنی بگرنەبەر.

د- ڕێکخستنی زانیاریەکانی ئەو میلاکاتانە کە ممارەسەی ئەرکەکانی ئەمنی تایبەتی دەکەن.

هـ- پشکنینو کۆنترۆڵ کردنی چالاکیەکانی ئاسایشی تایبەتی کە لە کاتالونیا ئەنجام دەدرێن.

و- هەماهەنگی کردن لە بواری خزمەتگوزاریەکانی ئاسایشو لێکۆڵینەوەی تایبەت لەگەڵ هێزەکانی پۆلیسی ئیدارەی کاتالونیا.

**ماددەی (١٦٤)**

**ئاسایشی گشتی**

١- ئەنجوومەنی گشتی لە بواری ئاسایشی گشتی، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر:

أ- دیاری کردنو ڕێکخستنی سیستەمێکی ئاسایشی گشتی تایبەتمەند لە کاتالونیا.

ب- دامەزراندنو ڕێکخستنی هێزی پۆلیسی ئەنجوومەنی گشتی بەنێو (Mossos di Esquadis)یە.

ج- ڕێکخستنو هەماهەنگی کردنی هێزەکانی پۆلیسی لوکالی.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لە بواری ئاسایشی هاوڵاتیانو نیزامی گشتیو پاراستنی ئەو مافە سەرەکیانە کە پەیوەندیان بەو بوارەوە هەیە کە بریتییە لە:

أ- ئەرکە حکومیەکان سەبارەت بە ممارەسەکردنی مافەکانی کۆبوونەوەو خۆپیشاندان.

ب- دەرکردنی بەڵگەنامە ڕەسمیەکان وەکو پاسەپۆرتو بەڵگەنامەکانی پێناسە.

ج- پاراستنی دارایی گشتیو کارکردن دژی گەندەڵی دارایی.

د- دانانی نیزامی هەڵگرتنو بەکارهێنانی چەكو تەقەمەنیەکانو مۆڵەت پێدانی چەك هەڵگرتن.

هـ- جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە کە پەیوەندی بە پاراستنی سروشتو ژینگەو سەرچاوە هیدرولۆژیەکانەوە هەیە.

٣- ئەنجوومەنی گشتی، لەڕێگای ئەنجوومەنێکی گشتی هاوبەشی ئاسایش بەشداری دەکات لە ڕێوشوێنەکانی ئاسایشو چالاکی هێزەکانی پۆلیسی دەوڵەتو کاتالونیا سەبارەت بە گۆڕینەوەی زانیاری لە بواری نێودەوڵەتیو پەیوەندیەکانی هاوکاریو یارمەتی دان لەگەڵ دەسەڵاتەکانی پۆلیسی دەوڵەتانی دی. پێویستە ئەنجوومەنی گشتی نوێنەرایەتی هەبێت لە تێکڕای شاندەکانو گشت گروپەکانی هاوکاری لەگەڵ پۆلیسی ئەو دەوڵەتانە کە دەوڵەتی ئیسپانیا بەشداری تیایدا دەکات.

٤- پۆلیسی ئەنجوومەنی گشتی (Mosos di Esquedi) گۆڕەپانی چالاکیەکانی سەرتاپای سنووری کاتالونیایەو ممارەسەی هەموو ئەرکە تایبەتیەکان دەکات لە چوارچێوەی هێزێکی پۆلیسی گشتیو تەواودا لەم بوارانەی خوارەوە:

أ- ئاسایشی هاوڵاتیانو نیزامی گشتی.

ب- پۆلیسی ئیداری.

ج- پۆلیسی دادوەرییو لێکۆڵینەوەی جینایی کە بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە شێوە جیاجیاکانی تاوانی (منظم)و تیرۆرزم.

د- کۆنترۆڵو چاودێری کردنی هاتوچۆ.

**ماددەی (١٦٥)**

**دەستەبەری کۆمەڵایەتی**

١- ئەنجوومەنی گشتی، لە بواری زەمانی کۆمەڵایەتی، بە گوێرەی ئەو پرنسیپانە کە تەشریعی سەرەکی دەوڵەت ڕێکی خستووە دەربارەی دەستەبەری کۆمەڵایەتی دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە. ئەو دەسەڵاتە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ-ڕێکخستنی سیستەمی ئاسایشی کۆمەڵایەتی.

ب- ڕێکخستنو ئیدارەکردنی زمەی دارایی‌و خزمەتگوزاریەکانی پێکهاتەی سیستەمی کۆمەڵایەتی لە کاتالونیا.

ج- ڕێکخستنو ممارەسەکردنی دەسەڵاتە ئیداریەکان سەبارەت بە ڕووداوەکانی کارو نەخۆشیە پیشەییەکان لەو دامەزراوەو کۆمپانیانە کە هاوکاری لەگەڵ زەمانی کۆمەلایەتی دەکەن.

د- بەڕێوەبردنو پشکنینو ئیدارەکردنی یارمەتیە ئابووریەکانی دەستەبەری کۆمەڵایەتی.

هـ- ڕێکخستنی تۆمارەکانی کۆمپانیاکانو لقەکانیان.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە بواری بەڕێوەبردنی خزمەتگوزاریەکانی نیزامی ئابووری زەمانی کۆمەڵایەتی کە بریتییە لە سەرپەرشتی کردنی یارمەتییە ئابووریەکانی سیستەمی زەمانی کۆمەڵایەتی‌و ڕێکخستنی لقەکانی خزمەتگوزاری.

**ماددەی (١٦٦)**

**خزمەتگوزاریەکانی کۆمەڵایەتی و خۆبەخش کردن و چاودێری ئاکام و پشتگیری کردنی خێزانەکان.**

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکان کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- رێکخستنی چالاکی خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکان و پێشکەش کردنی هاوکاری لە بواری تەکنیکی و ئابووری.

ب- رێکخستنی دەستەو کیانەکان و پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکان بە دامەزراوە گشتی و ئەهلیەکان لە کاتالونیا.

ج- ئامادەکردن و پەسندکردنی ئەو پلان و پرۆژە تایبەتیانە کە ئاراستەی ئەو کەس و کۆمەڵانە دەکرێ کە باری ژیانیان قورس و کەم دەرامەتە

د- چاودێری کردنی سیستەمەکانی پاراستنی کۆمەلایەتی کەرتی تایبەتی.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری خۆبەخش کردن کە پێک دێت لە دیاری کردنی چالاکی و باری رێکخستنی ئەو کەرتە و یارمەتی دانانی بەشێوەی تاك یان کۆ بەتایبەتی ئەوانەی کە لە کاتالونیا چالاکیەکانیان ئەنجام دەدەن.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لەسەر چاودێری کردنی منداڵو ناکامەکان کە بریتییە لە:

أ- دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر پاراستنی منداڵانو ناکامەکان.

ب- دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لە تەشریعی دەوڵەت لە بواری بەرپرسیاریتی تاوانکاری منداڵان.

٤- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری پشتگیری کردنی خێزانو منداڵانو ناکامەکان کە بریتییە لەو ڕێوشوێنانەی پاراستنی کۆمەڵایەتی بۆ شێوە جیاجیاکانی خێزانو چاودێری کردنیان.

**ماددەی (١٦٧)**

**سمبوڵە نیشتمانیەکان**

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بابەتی ڕێکخستنو ڕێزلێنان و بەرز ڕاگرتنی سمبوڵە نیشتمانیەکانی کاتالونیا، بەگوێرەی دەقەکانی ئەم یاسای بنەڕەتییە.

**ماددەی (١٦٨)**

**سیستەمی چاکسازی**

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لە تەشریعی دەوڵەت لە بواری چاکسازی کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- لێهاتوویی بۆ دەرکردنی تەشریعاتی چاکسازی بە مەرجێك بگونجێت لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی کاتالونیا.

ب- تێکڕای چالاکیەکانی چاکسازی لە کاتالونیا، بەتایبەتی، ڕێکخستنو دانانی نیزامو ئیدارەکردنو نەخشەکێشانو پشکنینی دامەزراوەکانی چاکسازی بە هەموو جۆرەکانیشەوە کە لە کاتالونیا کاردەکەن.

ج- پلان دانانو دروست کردنو ریفۆرمی دامەزراوەکانی چاکسازی سنووری کاتالونیا.

٢- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە ڕێوشوێنەکانی بەخشینی لێبوردنو کۆکردنەوەی زانیاری لەو بارەیەوە.

**ماددەی (١٦٩)**

**گواستنەوە**

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر هۆیەکانی گواستنەوەی زەمینیو نەفەر هەڵگرو بازرگانیو ڕێگاویانو شەمەندەفەرو کێبڵو ئەوانەی دی کە بە زۆری لە سنووری کاتالونیا هاتووچۆ دەکەن، بەمەرجی ڕاگرتنی سەربەخۆی ژێر خانەکەیان.

ئەم دەسەڵاتە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

أ- ڕێکخستنو نەخشەکێشانو بەڕێوەبردنو هەماهەنگی کردنو پشکنینی خزمەتگوزاریەکانو چالاکیەکانیان.

ب- ڕێکخستنی توانستی پیشەیی‌و چاودێری کردنی ئیداری لەپێناو
چارەسە کردنی چالاکیەکانی گواستنەوە.

ج-دانانی مەرجە پاشکۆیەکان دەربارەی ڕێکخستنی گرێ بەستی گواستنەوەو گەیاندن.

د- ڕێکخستنی گواستنەوەی شارستانی‌و خزمەتگوزاریەکانی گواستنەوەی هەڵبژاردەیی نەفەرەکان بەهۆیەکانی گواستنەوەی گەشتیاریشەوە.

ه- ڕێکخستنی هۆیەکانی گواستنەوە تایبەت بە گەشتیاری، قوتابخانەکان یان گواستنەوەی منداڵان، تەندروستی، ماتەمینی، بازرگانی مەترسیدار یان هۆیەکانی دی کە پێویست بە نیزامێکی تایبەتمەند هەبێت.

و- ڕێکخستنی سیستەمێکی تەحکیمی لە بواری گواستنەوە.

ز- دەسەڵاتی نرخ دانانی لەسەر گواستنەوەی زەمینی.

٢- ئەنجوومەنی گشتی سەلاحیاتی راپەڕاندنی هەیە لەسەر تەشریعی دەوڵەت سەبارەت بەو هۆیانەی گواستنەوەی زەمینی کە سەرچاوەو کۆتاییان لە کاتالونیایە، هەرچەندە بە تەواوەتی لە سنووری کاتالونیادا بسوڕێنەوە.

٣- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە دانان‌و دابین کردنی خزمەتگوزاریەکانی ئەو هێڵە شەمەندەفەرانە کە گواستنەوەو

گەیاندن زامن دەکات لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی تر یان لەگەڵ ترانزێنی نێودەوڵەتی.

٤- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر ئەو سەنتەرو چالاکیانە کە پەیوەندیان بە رێکخستنی گواستنەوەو تەسویقو دابەشکردن هەیەو نیشتەجێی کاتالونیان.

٥- ئەنجوومەنی گشتی بەگوێرەی یاسا لەبابەتی گواستنەوەی ئاسمانی، دەسەڵاتی راپەڕاندنو چاودێری ئیداری هەیە.

٦- ئەنجوومەنی گشتی بەگوێرەی یاسا دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بواری گواستنەوەی دەریاوانیو رووبار کە بە زۆری بە ئاوەکانی کیشوەریی یان دەریاوانی هەرێمایەتی کاتالونیادا دەسوڕێنەوە.

**ماددەی (١٧٠)**

**کارو پەیوەندیەکانی کارکردن**

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لە بواری کارو پەیوەندیەکانی کارکردن، کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

١- دیاری کردنی چوارچێوەیەك بۆ پەیوەندیەکانی کارکردن.

٢- دانانی سیاسەتە کاریگەرەکانی کارکردن.

٣- پۆلین کردنی پیشەکان لە کاتالونیا.

٤- تەحکیم کردن لە بواری کارکردندا، مۆڵەت پێدانو کۆنترۆڵ کردنی ئاژانسەکانی دامەزراندن.

٥- پەرەپێدان بە پێوەرەکانی دانوساندنی جەماعیو تۆمار کردنی ڕێکەوتنامە جەماعیەکانی کارکردنی ئەو کۆمپانیانە کە چالاکیەکانیان لە کاتالونیا ئەنجام دەدەن.

٦- ڕێوشوێنەکانی ڕێکخستنی کارو چالاکی ئیداری لەبواری گواستنەوەی بە کۆمەڵ لە حاڵەتی ئەو سەنتەرانەی کارکردن کە لە کاتالونیادان.

٧- خۆپاراستن لە مەترسیەکانی کارو ئاسایشو تەندروستی.

٨- دانانی سزا بۆ سەرپێچیەکانی نیزامی کۆمەڵایەتی.

٩- دیاری کردنی ڕادەی کەمترین خزمەتگوزاری کاتی لە کاتی مانگرتنەکان کە لە کاتالونیا روو دەدەن.

١٠- چاودێری کردنی شەرعیەتی ڕێکەوتنامەو پەیمانامەکانی کارکردن لەو کۆمپانیانە کە بە شێوەیەکی سەرەکی چالاکیەکانیان لە کاتالونیا ئەنجام دەدەن.

١١- ڕێکخستنو کۆنترۆڵو تەنسیقو بەدواداچوونی ڕووداوەکانی کارو نەخۆشیە پیشەیەکان.

١٢- دانانی سیاسەتی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی بێکاریو کۆمەك کردنی بێکاران.

١٣- مەیسەر کردنی ئامرازەکانی پێکەوە ژیانو ویفاقو ناو بژیوانیو تەحکیمی لە بواری کارکردندا.

١٤-دیاری کردنی ڕۆژانی پشوودان لە ساڵێکدا لە سنووری کاتالونیا.

١٥- چاودێری کردنی بوارەکانی کارکردن بەگوێرەی ماددەی (١٣٦).

**ماددەی (١٧١)**

**گەشتوگوزار**

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لە بابەتی گەشتوگوزار کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

١- دانانی پلانو نەخشەکێشان لە بواری کەرتی گەشتوگوزاردا.

٢- پشتگیری کردنی بواری گەشتوگوزارو بەشداری کردن لەو ڕێکەوتنامانە کە لەگەڵ کیانە بیانیەکان دەبەسترێنو کردنەوەی نووسینگە لە دەرەوەی وڵات.

٣- پۆلین کردنی کۆمپانیاو دامەزراوەکانی گەشتوگوزاریو ئیدارە کردنی تۆڕی دامەزراوە گەشتوگوزاریەکانی کەرتی گشتی، کە بریتییە لە دامەزراندنی تۆڕی "ئوتێلە نیشتمانیەکان" لە سنووری کاتالونیا.

٤- ڕێکخستنی مافو ئەرکە تایبەتمەندیەکانی بەکاربەرانو پێشکەشکارانی خزمەتگوزاریەکانی کەرتی گەشتوگوزارو دۆزینەوەی هۆکارە بەدیلەکانی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان.

٥- خوێندنو زانیاری لەبواری گەشتوگوزار.

٦- دیاری کردنی پێوەرو کۆنترۆڵ کردنی تێکڕای هێڵە گشتییەکانی یارمەتیو پشتگیری کردنی کەرتی گەشتوگوزار.

**ماددەی (١٧٢)**

**زانکۆکان**

١) ئەنجوومەنی گشتی، لە بواری خوێندن لە قۆناغی زانکۆ بێ زیان گەیاندن بە سەربەخۆی زانکۆ، دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر:

١- پرۆگرام دانانو تەنیسق کردن لە سیستەمی زانکۆکانی کاتالونیا.

٢- دامەزراندنی زانکۆ گشتییەکانو مۆڵەت دان بە زانکۆ ئەهلیەکان.

٣- دانانی نیزامی یاسایی ڕێکخستنو ئیدارەکردنی زانکۆ گشتییەکان.

٤- تەنسیق کردن لە بواری ڕێوشوێنەکانی وەرگرتن لە زانکۆکان.

٥- دانانی چوارچێوەی یاسایی بۆ بڕوانامە تایبەتیەکانی زانکۆکان بەگوێرەی پرنسیپی سەربەخۆی زانکۆ.

٦- یارمەتی دانی دارایی زانکۆکانو چاودێری کردنی سەرچاوە داراییەکانی دەوڵەت لە بواری خوێندنی زانکۆیدا.

٧- ڕێکخستنی زەمالەو یارمەتیەکان بۆ پێکهاتەی زانکۆکان.

٨. دانانی نیزامی پاداشت بۆ میلاکی فێرکاریو توێژینەوە.

٢) ئەنجوومەنی گشتی لە بواری خوێندنی زانکۆ، بێ زیان گەیاندن بە سەربەخۆیی زانکۆ، دەسەڵاتی هاوبەشی هەیە لەسەر تەواوی ئەو بڕگانە کە لە پەڕەگرافی یەکەمدا ئاماژەی پێ کراوە، کە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە:

١- ڕێکخستنی مەرجەکانی دامەزراندنو دانپێدانان بە زانکۆو سەنتەرە زانکۆییەکان. هەروەها دامەزراندنو هەڵوەشاندنەوەی زانکۆ گشتییەکانو دانپێنانو هەڵوەشاندنەوەی زانکۆ ئەهلیەکان کە بە زۆری چالاکیەکانیان لە کاتالونیا ئەنجام دەدەن.

٢- ڕێکخستنی نیزامی وەرگرتن لە زانکۆکان.

٣- پلان دانانو داڕشتنی پرۆگرامەکانی خوێندن بەگوێرەی پرنسیپو پێوەرەکانی تەشریعی سەرەکی دەوڵەت.

٤- ڕێکخستنی نیزامی میلاکاتی مامۆستاو توێژەرانو کارمەندانی زانکۆ.

٥- نرخاندنو زامن کردنی جۆرو ئاستی خوێندن لە زانکۆکان.

٣) دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لەسەر یەکسانی کردنی بڕوانامە فەرمیەکان لە زانکۆکان.

**ماددەی (١٧٣)**

**چاودێری ڤیدیۆیی و کۆنترۆڵ کردنی دەنگو تۆمارکردن**

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە لەسەر بەکارهێنانی ئامێرەکانی چاودێرەی ڤیدیۆیی و کۆنترۆڵ کردنی دەنگو تۆمارکردنی هۆیەکانی دی لەم جۆرە لە بواری کەرتی گشتیدا، یان بەکارهێنانیان لەلایەن هەر هێزێکی پۆلیس یان کۆمپانیاو دامەزراوەیەکی تری ئەهلی. پێویستە ئەنجوومەنی گشتی ممارەسەی ئەم دەسەڵاتە بکات بە ڕێزگرتن لە ناوەڕۆکی جەوهەری مافە سەرەکیەکان.

**دەروازەی پێنجەم**

**دەربارەی پەیوەندییەکانی ئە نجوومەنی گشتی لەگەڵ دەوڵەت و لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی دی و یەکێتی ئەوروپاو بەڕێوەبردنی کاروباری دەرەوەی ئە نجوومەنی گشتی.**

**بەشی یەکەم**

**پەیوەندی ئە نجوومەنی گشتی لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی دی**

**ماددەی (١٧٤)**

**بنەما سەرەکیەکان**

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی و دەوڵەت بە دوو قۆڵی ئاڵوگۆڕی زانیاری بکەن و یارمەتی یەکتری بدەن و هاوکاری بکەن هەر کاتێ پێویستی کرد بۆ ڕاپەڕاندنی دەسەڵاتەکانی هەردوولا

بەشێوەیەکی کاریگەرو بەرگری بکەن لە بەرژەوەندیەکانی هەردوولا.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی تردا پەیوەندی هاوکاری ببەستێت بۆ دیاری کردنی سیاسەتە هاوبەشەکانیان بۆ راپەڕاندنی دەسەڵاتەکانیان بەشێوەیەکی کاراتر.

٣- ئەنجوومەنی گشتی پێویستە بەشداری بکات لە دامو دەزگاو ئۆرگانیزمو رێوشوێنەکانی وەرگرتنی بڕیارەکانی دەوڵەت لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانیاندا بەپێی ئەم یاسای بنەڕەتییەو تەشریعی ئەساسی پەیوەندیدار.

**بەشی یەکەم**

**هاوکاری لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی تر**

**ماددەی (١٧٥)**

**ئامرازی هاوکاری کردن لەنێوان ئەنجوومەنی گشتی و دەوڵەت**

١- ئەنجوومەنی گشتیو دەوڵەت لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی هەردوولادا دەتوانن رێکەوتنامەی هاوکاری مۆر بکەنو هۆکاری دی بەکار بهێنن، کە بە گونجاوی بزانن، بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی بەرژەوەندی هاوبەش.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتدا بکات، لەرێگاەوزکی ئۆرگانو رێوشوێنی فرەلایەن لە بوارو کاروباری بەرژەوەندی هاوبەش.

**ماددەی ( ١٧٦ )**

**کاریگەری هاوکاری لەنێوان ئەنجوومەنی گشتیو دەوڵەت**

١- بەشـــداری کردنـــی ئەنجوومـــەنی گـــشتی لـــە ئۆرگـــانو میکانیزمەکانی دوو قۆڵیو فرەلایـەن لەگـەڵ دەوڵـەتو کۆمـەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی دی.

٢- ئەنجوومـەنی گـشتی پەیوەسـت نابێـت بـەو بڕیارانـە کـە لـە چوارچـێوەی میکـانزمێکی فرەلایـەن لەگـەڵ دەوڵـەتو کۆمـەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی دی ساز دەدرێت.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێـت (تحفـظ) بکـات سـەبارەت بـەو ڕێکەوتنامە کە لـە چوارچـێوەی میکـانزمی فرەلایـەنی هاوکـاری وەردەگیرێـت ئەگـەر بـەبێ ڕەزامەنـدی ئەنجوومـەنی گـشتی وەرگیرابێت.

**ماددەی ( ١٧٧ )**

**نیزامی پەیمانامەکانی نێوان ئەنجوومەنی گشتیو دەوڵەت**

١- نیزامی یاسایی ئەو پەیمانامانە کە لەلایەن ئەنجوومەنی گـشتی مۆر کرابن پێویستە لەلایەن یاسای پەرلەمانەوە دابنرێت.

٢- پێویستە ئەو پەیمانامانەی کە لەنێوان حکومـەتی ئەنجوومـەنی گشتیو حکومەتی ناوەندی ساز دەدرێـن لـە "ڕۆژنامـەی فـەرمی ئەنجوومەنی گشتی کاتالونیا" بڵاوکرابێتەوە لەماوەی یەك مانگـدا

هەر لە ڕۆژی مۆر کردنیەوە. مێژووی بڵاوکردنەوەی لە "ڕۆژنامەی فەرمی دەوڵەت" کاریگەر دەبێت سەبارەت بە لایەنی سێهەمەوە.

**ماددەی (١٧٨)**

## پەیماننامەو ڕێکەوتننامەکان لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی تر

١- ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی تردا پەیماننامەی هاوکاریو ڕێکەوتننامەی یارمەتیو کۆمەك ببەستێت لە بواری کاروباری بەرژەوەندی هاوبەشدا.

٢- دەکرێت پەیماننامەو ڕێکەوتننامەکانی هاوکاری لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی تردا لەنێو ناوەڕۆکەکانی تردا، ئۆرگانە تێکەڵاوەکانی دانانی پرۆژەکانو نەخشەکێشانو پرۆگرامی هاوبەش لەخۆ بگرێت.

٣- سازدانی ڕێکەوتننامەو پەیماننامەکان تەنیا پێویستی بە پەسندکردنی پێشوەختی پەرلەمان هەیە.

٤- پێویستە پەرلەمانی ئیسپانی ئاگادار بکرێتەوە لەو پەیماننامانەی هاوکاری کە لەلایەن ئەنجوومەنی گشتی لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکان مۆر دەکرێن.

٥- پێویستە ئەو ڕێکەوتننامەو پەیماننامانە کە لەلایەن ئەنجوومەنی گشتی لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی دی مۆر دەکرێن لە "ڕۆژنامەی فەرمی ئەنجوومەنی گشتی کاتالونیا" بڵاوبکرێتەوە لەماوەی چلو پێنج ڕۆژدا، هەر لە ڕۆژی مۆر کردنیەوە.

## بەشی دووەم
## بەشداری بوون لە دامودەزگاکانی دەوڵەت و ڕێوشوێنەکانی وەرگرتنی بڕیارەکان

### ماددەی (١٧٩)
### ئامادەبوونی سیناتۆرەکانی کاتالونیا لەبەردەم پەرلەمان

ئەنـدامانی ئەنجوومـەنی پـیران کـە لـە کاتالونیـا هەڵبـژێراون و نوێنەرایەتی ئەنجوومـەنی گـشتی دەکـەن لـە ئەنجوومـەنی پـیران، دەتوانن لە بەردەم پەرلەمان ئامادە بـن لەسـەر داوای خۆیـان یـان لەسەر داواکاری پەرلەمان بۆ ئاگادار بوون لـەبارەی چـالاکیەکانیان لە ئەنجوومەنی پیران لـە چوارچـێوەی پـەیڕەو پرۆگرامـی نـاوخۆیی پەرلەمان.

### ماددەی (١٨٠)
### دەستنیـشان کردنـی ئەنـدامانی دادگـای دەسـتووریی و ئەنـدامانی ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی دادوەری.

پێویـستە ئەنجوومـەنی گـشتی بەشـداری بکـات لـە پرۆسـەکانی دەستنیشان کردنی دادوەرانـی دادگـای دەسـتووریی و راوێژکـەرانی یاسـایی ئەنجوومـەنی گـشتی دەسـەلاتی دادوەرەیـی، پێویـستە پەرلەمانیش پێشنیاری خۆی بکات سەبارەت بەو ئەندامانـەی ئـەم ئۆرگانە دەستووریەو ئەنجوومەنی پیرانیس پێویستە دیاریبان بکـات لـە چوارچـێوەی تەشـریعی ئەساسـی بـەپێی پـەیڕەی نـاوخۆی ئەنجوومەنی پیران.

**ماددەی (١٨١)**

**بەشداری کردن لە ڕێکخستنی گشتی چالاکی ئابووری**

ئەنجوومەنی گشتی پێویستە بەشداری بکات لە ئامادەکردنی ئەو بڕیارانەی دەوڵەت کە پەیوەندیان بە ڕێکخستنی گشتی چالاکی ئابوورییەوە هەیە لە چوارچێوەی ئەو ڕێوشوێنو ئۆرگانیزمانە کە لە ماددەی (١٣١،٢) دەستووری ئیسپاندا هاتووە.

**ماددەی (١٨٢)**

**دەستنیشان کردنی نوێنەران لە ئۆرگانیزمە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان**

١ – ئەنجوومەنی گشتی دەستنیشانی نوێنەرانی دەکات لە ئۆرگانەکانی بەڕێوەبەرایەتی بانقی ئیسپانیا، لیژنەی نیشتمانی بازاری ئابووریو لیژنەی بازاڕی گەیاندنی تەلو بێ تەلو ئۆرگانیزمەکانی دی دەوڵەت کە ئەرکی دەسەڵاتی ڕێکخەرییە لەو بوارانەی ئابووریو کۆمەڵایەتی کە پەیوەندیان بە دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتییەوە هەیە.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەستنیشانی نوێنەرانی دەکات لە ئۆرگانەکانی بەڕێوەبەرایەتی ئۆرگانیزمە ئابووریو وزەییەکانو دامەزراوە داراییو کۆمپانیا گشتییەکانی دەوڵەت کە دەسەڵاتیان لە سنووری کاتالونیا تێدەپەڕێت.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەستنیشانی نوێنەرانی دەکات لە دادگای ژمێریای، ئەنجوومەنی ئابووریو کۆمەڵایەتی، ئاژانسی گومرگی،

لیژنەی نیشتمانی وزە، ئاژانسی پاراستنی زانیاریەکان، ئەنجوومەنی رادیۆو تەلەفزیۆن، لە چوارچێوەی تەشریعاتی بەرکاردا.

٤- ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت پێشنیارەکانی ناراستەی ئەو ئۆرگانیزمانە بکات کە لە بڕگەی (١، ٢) ئاماژەی پێ کراوە.

**بەشی سێیەم**

**لیژنەی دوو قۆلی ئەنجوومەنی گشتی- دەولەت**

**ماددەی (١٨٣)**

**ئەرك و پێکهاتەی لیژنەی دوو قۆلی ئەنجوومەنی گشتی- دەولەت**

١- لیژنەی دوو قۆلی ئەنجوومەنی گشتی- دەولەت بەپێی ئەو پرنسیپانە کە لە ماددەی (٣، ١)و ماددەی (١٦٨)دا هاتووە، چوارچێوەیەکی گشتیو هەمیشەیی پەیوەندی پێك دێنێت لەنێوان ئەنجوومەنی گشتیو دەولەت بەم شێوەی خوارەوە:

أ- بەشداری کردنی ئەنجوومەنی گشتی لە ممارەسە کردنی ئەو دەسەلاتانەی دەولەت کە پەیوەندیان بە ئۆتۆنۆمی کاتالونیاوە هەیە.

ب- ئالوگۆڕ کردنی زانیاریو دانانی میکانزمەکانی هاوکاری لە بواری سیاسەتی گشتیو کاروباری بەرژەوەندی هاوبەشی هەردوولا.

٢- ئەرکەکانی لیژنەی ڕاوێژو پێشنیارکردنو سازدانی ڕێکەوتنامە لەو حالەتانەی کە لەم یاسای بنەڕەتییەدا دانراوە، بەگشتی، ئەوانەی پەیوەندیان بەم بوارانەی خوارەوە هەیە:

أ- ئامادەکردنی ئەو پرۆژەو پێوەرانەی دەوڵەت کە پەیوەندیان بە دەسەڵاتو بەرژەوەندیەکانی کاتالونیاوە هەیە.

ب- پرۆگرامو دانانی سیاسەتە گشتییەکانی ئابووری حکومەتی ناوەندی، بەتایبەتی، ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیان بە بەرژەوەندیو دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتییەوە هەیە.

ج- گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو بۆ باشترکردنی پەیوەندیەکان لەنێوان دەوڵەتو ئەنجوومەنی گشتیو زامن کردنی ممارەسەکردنی دەسەڵاتەکانی بەشێوەیەکی کارا لەپێناو بەرژەوەندی هاوبەش.

د- ناکۆکیەکانی سەلاحیات کە لەنێوان هەردوولادا سەرهەڵدەدەن.

هـ- نرخاندنی وەزیفەکانو میکانزمەکانی هاوکاری کە لە نێوان دەوڵەتو ئەنجوومەنی گشتی دانراوە.

٣- لیژنەکە پێک دێت لە ژمارەیەکی یەکسان لە نوێنەرانی دەوڵەتو ئەنجوومەنی گشتی. سەرۆکایەتیەکەی بە نۆرە ممارەسە دەکرێت لە نێوان هەردوولا. سکرتێریەکی هەمیشەیی دەبێتو دەتوانێت لیژنەی فەرعی دروست بکات، سالانە ڕاپۆرتێک ئامادە دەکاتو ڕەوانەی حکومەتی ناوەندیو حکومەتی ئەنجوومەنی گشتیو پەرلەمانی دەکات.

٤- لیژنەکە لە ساڵێکدا دووجار کۆدەبێتەوە.

٥- ئەو لیژنەیە پەیڕەوی ناوخۆیی خۆی دادەنێتو وەزیفەکانیش بە ڕەزامەندی هەردوولا دەبێت.

**بەشی دووەم**

## پەیوەندییەکانی ئەنجوومەنی گشتی لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا

**ماددەی (١٨٤)**

**بنەما سەرەکییەکان**

پێویستە ئەنجوومەنی گشتی، لە چوارچێوەی ئەحکامەکانی ئەم یاسای بنەڕەتییەدا، بەشداری بکات لەو کاروبارانە کە پەیوەندیان بە یەکێتی ئەوروپاو دەسەڵات یان بەرژەوەندییەکانی کاتالونیاوە هەیە.

**ماددەی (١٨٥)**

**بەشداری کردن لە ڕێکەوتنامەکان**

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی ئاگادار بکرێتەوە لەلایەن حکومەتی ناوەندییەوە لە پێشنیارەکانی پێداچوونەوە لە ڕێکەوتنامەکانی یەکێتی ئەوروپاو لە پرۆسەکانی تۆمارکردنو پەسندکردنی ئەو ڕێکەوتنامانە. پێویستە حکومەتی ناوەندیو پەرلەمانی ئیسپانی تێبینیەکانی خۆیان کە پەیوەندی بەو لایەنەوە هەیە ئاراستە بکەن.

٢- پێویستە حکومەتی ناوەندیو نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی گشتی بەشداری بکەن لەو شاندە ئیسپانیانە کە بەشداری دەکەن لە پرۆسەکانی پێداچوونەوەو دانوستان لە ڕێکەوتنامەکان.

**ماددەی (١٨٦)**

## بەشداری کردن لە پێکهاتەی پێگەکانی دەوڵەت

١- ئەنجوومەنی گشتی بەشداری دەکات لە پێکهاتەی پێگەکانی دەوڵەت لەبەردەم یەکێتی ئەوروپا، بەشێوەیەکی سەرەکی لە ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی ناوەندی، لەو کاروبارانە کە پەیوەندیان بە سەلاحیات یان بەرژەوەندیەکانی کاتالونیاوە هەیە، لەو چوارچێوەیەدا کە ئەم یاسای بنەڕەتیەدا ڕێی پێدەدات.

٢- ئەنجوومەنی گشتی پێویستە بەشداری بکات بەشێوەی دوو قۆڵی لە پێکهاتەی پێگەکانی دەوڵەت لە کاروباری ئەوروپا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان پێوە هەیە.

٣- پێویستە دەوڵەت بەشێوەیەکی ئاسایی ئەنجوومەنی گشتی ئاگادار بکاتەوە، لەسەرجەم حاڵەتەکان، سەبارەت بە دەستپێشخەریو پێشنیارەکان کە پێشکەشی یەکێتی ئەوروپا کراون. حکومەتی ئەنجوومەنی گشتیو پەرلەمانی کاتالونیا پێویستە، بەپێی پێویست، تێبینیو پێشنیارەکان ئاراستەی حکومەتی ناوەندیو پەرلەمانی ئیسپانی بکات.

**ماددەی ( ١٨٧ )**

## بەشداری کردن لە دامەزراوو ئۆرگانیزمە ئەوروپیەکان

١- نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی گشتی ڕاستەوخۆ بەشداری دەکەن لە تێکڕای شاندە ئەوروپیەکان لەبەردەم یەکێتی ئەوروپا بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە بەرژەوەندی کاتالونیاوە بێت.

٢- ئەنجوومەنی گشتی، لە چوارچێوەی دەسەڵاتە تایبەتیەکان، دەتوانێت ممارەسەی نوێنەرایەتی دەوڵەت بکات، ئەگەر پێویستی کرد.

٣- ئەنجوومەنی گشتی، بە ڕەزامەندی دەوڵەت، لە چوارچێوەی نوێنەرایەتی هەمیشەیی دەوڵەت، دەستنیشانی نوێنەرانی دەکات لە دامودەزگاو ئۆرگانەکانی یەکێتی ئەوروپا.

٤- پەرلەمان دەتوانێت پەیوەندیەکانی دروست بکات لەگەڵ پەرلەمانی ئەوروپا لە چوارچێوەی بەرژەوەندی هاوبەش.

**ماددەی ( ١٨٨ )**

## بەشداری کردن لە کۆنترۆڵ کردنی پرنسیپەکان

پێویستە پەرلەمان پێشوەخت ڕاوێژی پێ بکرێت بەر لە دەرکردنی هەر بڕیارێك لەلایەن پەرلەمانی ئیسپانیەوە سەبارەت بە پێشنیاری تەشریعیەکانی ئەوروپی لە چوارچێوەی ڕێوشوێنەکانی کۆنترۆڵ کردنی پرنسیپەکانی یارمەتیو کۆمەك کردنو هاوسەنگی کە

یاسای یەکێتی ئەورووپا لەو بارەیەوە دایدەنێت، بەتایبەتی، ئەگەر ئەو پێشنیارانە پەیوەندیان بە دەسەڵاتەکانی ئەنجوونی گشتییەوە بێت.

**ماددەی (١٨٩)**

## جێبەجێکردن و پەیڕەوکردنی یاسای یەکێتی ئەورووپا

١- ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت یاسایی یەکێتی ئەورووپا جێبەجێ و پەیڕەو بکات لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی. بوونی یاسایەکی ئەورووپی نابێتە مایەی گۆڕینی یاسایەکی ناوخۆیی کە لەم یاسای بنەڕەتییەدا هاتووە.

٢- پێویستە دەوڵەت، لە حاڵەتی جێبەجێکردنی یاسای ئەورووپی ئەگەر پێویست بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی ناوخۆی کردو لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتەکانی کاتالونیاو کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکان بوو، ڕاوێژکاری بە ئەنجوومەنی گشتی بکات سەبارەت بەو حاڵەتانە بەر لەوەی هیچ ڕێوشوێنێك بگرێتەبەر.

٣- لە حاڵەتێکدا ئەگەر یەکێتی ئەورووپا هەر تەشریعێك دەربکات دەربارەی ئەو بابەتە، ئەوە دەوڵەت لەو بارەیەوە دەسەڵاتی دەبێت بۆ دەرکردنی ئەو ڕێسایانە، ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت ڕاستەوخۆ تەشریع لەو بابەتە دەربکات بەگوێرەی یاساکانی ئەورووپا.

## ماددەی ( ١٩٠ )

## بەڕێوەبردنی سەرمایە ئەورووپییەکان

١- ئەنجوومەنی گشتی، لە بواری دەسەڵاتەکانی خۆی، ئیدارەی سەرمایە ئەورووپییەکانی دەکەوێتە ئەستۆی.

٢- ئیدارەکردنی سەرمایەکان، لە چوارچێوەی دەسەڵاتە تەشریعیەکانی ئەنجوومەنی گشتی، بریتییە لە دەسەڵاتەکانی بڕیاردان لەسەر بابەتی دیاریکراو، مەرجەکانی ئیتمان، ڕێکخستنی ڕێوشوێنەکانی بەخشین، ڕێوشوێنەکانی یاسایی، دانەوەو کۆنترۆڵو پشکنین.

٣- لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەو سەرمایە ئەورووپیانە هەرێمایەتی نەبن، دەوڵەت پێویستە بارودۆخێکی یاسایی دروست بکاتو ئەنجوومەنی گشتی پێویستە بەشداری لە ئۆرگانەکان یان لە ڕێوشوێنەکانی دابەش بکات. بەشدار بوونی ئەنجوومەنی گشتی مۆرکی یەکلایکەرەوەی هەیە بۆ دەوڵەت لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەو سەرمایانە پەیوەندیان بە چارەسەکردنی دەسەڵاتە تایبەتمەندیەکانەوە هەبێت.

### ماددەی ( ١٩١ )

### داواکاری لەبەردەم دادگای دادوەریی

١- ئەنجوومەنی گشتی مافی پەنابردنی، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەیە بۆ دادگای دادوەریی یەکێتی ئەوروپا لەو چوارچێوەیەدا کە یاساکانی ئەوروپا دیاری کردووە.

٢- حکومەتی ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت داوا لە حکومەتی ناوەندیو لیژنەی هەرێمەکان بکات بۆ بەرزکردنەوەی داواکان بۆ بەردەم دادگای دادوەریی یەکێتی ئەوروپا بۆ بەرگری کردن لە بەرژەوەندیە شەرعیو دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی. ئەنجوومەنی گشتی داواکاری دادوەریی خۆی بەڕێوە دەبات بەگوێرەی پێگەی خۆی لەو ئیجراناتانە.

٣- حکومەتی ناوەندی ئەو جۆرە داوایانە ڕەت دەکاتەوە کە زیانی مەترسیداری هەبێت بۆ یەکپارچەیی سیاسەتی دەوڵەت، کە پێویستە ئەو حاڵەتانە بخرێتە بەر دەستی لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی ـ دەوڵەت.

### ماددەی ( ١٩٢ )

### شاندی ئەنجوومەنی گشتی لەبەردەم یەکێتی ئەوروپا

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی شاندی هەبێت لەنێو دامەزراوەکانی یەکێتی ئەوروپا.

٢- ئەندامانی شاندی ئەنجوومەنی گشتی لەنێو دامەزراوەکانی یەکێتی ئەورووپا نیزامێکی هاوشێوەی نیزامی میلاکاتی نوێنەرانی دەوڵەتیان هەیە لەبەردەم یەکێتی ئەورووپا.

**ماددەی (١٩٣)**

## بازنەی هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی ئەورووپی

بۆ ئەوەی سنووری کاتالونیا بە تەنیا یان لەگەڵ سنوورەکانی کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکانی دراوسێدا، ببێتە بازنەیەك بۆ هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ئەورووپا، پێویستە یاسای ئەساسی هەڵبژاردن ئەو بابەتە دیاری بکات.

## بەشی سێهەم

## کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی گشتی

**ماددەی (١٩٤)**

## بنەما سەرەکیەکان

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی رووی کاتالونیا بە دەرەوە پیشان بدات‌و داکۆکی بکات لە بەرژەوەندیەکانی لەم بارەیەوە.

٢- دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی لێهاتوویی هەیە بۆ ئەنجام دانی کاروباری دەرەوە ڕاستەوخۆ یان ئەگەر پێویستی کرد لە ڕێگای دەوڵەتەوە.

## ماددەی ( ١٩٥ )

## شاندەکانی دەرەوە

١- ئەنجوومەنی گشتی، بۆ داکۆکی کردن لە بەرژەوەندیەکانی کاتالونیا، دەتوانێت شاند یان نووسینگەی نوێنەرایەتی لە دەرەوە هەبێت.

٢- میلاکاتی شاندەکانی ئەنجوومەنی گشتی لە دەرەوە نیزامی پێویستی دەبێت بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانیان.

## ماددەی ( ١٩٦ )

## رێکەوتنامەکانی هاوکاری

ئەنجوومەنی گشتی، بۆ داکۆکی کردن لە بەرژەوەندیەکانی کاتالونیا، دەتوانێت رێکەوتنامەی هاوکاری مۆر بکات لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی. بۆ ئەو مەبەستە، ئۆرگانەکانی نوێنەرایەتی دەرەوەی دەوڵەت پێویستە بە گوێرەی پێویست پشتگیری پێشنیارەکانی ئەنجوومەنی گشتی بکەن.

## ماددەی ( ١٩٧ )

## رێکەوتنامەو پەیمانامە نێودەوڵەتیەکان

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پێشوەخت لەلایەن حکومەتی ناوەندیەوە ئاگاردار بکرێتەوە سەبارەت بە پرۆسەکانی دانوستاندنی

ڕێکەوتنامـەو پەیمانامـە نێودەوڵەتیـەکان، ئەگـەر پەیوەنـدیان بـە دەسەڵاتەکان یان بەرژەوەندیەکانی کاتالونیاوە هەبێت.

٢- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی بەشـداری بکـات لـە پرۆسـەکانی دانوسـتاندن لـەو ڕێکەوتنامـەو پەیمانامـە نێودەوڵەتیانـە کـە پەیوەندیان بە دەسەڵاتەکانیەوە هەیە.

٣- ئەنجوومەنی گـشتی دەتوانێـت لـە حکومـەتی ناوەنـدی داوای سازدانی ئەو ڕێکەوتنامەو پەیمانامانە بکات، یان داوای ئیزن بکات لە پەرلەمانی ئیسپانی بۆ مۆرکردنی ئەو ڕێکەوتنامانە، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندیان بە بەرژەوەندی کاتالونیاوە هەیە.

٤- ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت داوای مۆڵەت لە دەوڵـەت بکـات بۆ ئیمزاکردنی ئەو ڕێکەوتنامەو پەیمانامـە نێودەوڵەتیانـە بـەناوی حکومەتی ناوەندیەوە لەچوارچێوەی دەسەڵاتەکانی خۆی.

٥- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی ڕێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر بـۆ جێبەجێکردنی ئەو ئیلتزاماتانە کە لـەو ڕێکەوتنامـەو پەیمانامـە نێودەوڵەتیانە هاتووە لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی.

**ماددەی (١٩٨)**

## هاوکاری دەرەوەی سنووری کاتالونیاو هەرێمەکان

١- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پەرە بـە هاوکـاری بـدات لەگـەڵ هەرێمـە ئەوروپیـەکانو ئـەو ناوچـانە کـە بەرژەوەنـدی ئـابووری و

کۆمەڵایـەتی‌و ژینگـەیی‌و کـەلتوری هاوبەشـی هەیـە لەگـەڵیان‌و پێویستە پەیوەندیەکانی لەم بارەیەوە چڕتر بکاتەوە.

٢- پێویـستە ئەنجوومـەنی گـشتی پـەرە بـە هاوکـاری لەگـەڵ هەرێمەکانی تر بدات لەو چوارچێوەیەدا کە لە بڕگەی ١دا هاتووە.

٣- پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پەرە بە پرۆگرامـەکانی هاوکـاری بدات لە پێناو بەرەوپێشچوون‌و پێشکەوتنیدا.

**ماددەی ( ١٩٩ )**

## بەشداری کردن لە ئۆرگانیزمە نێودەوڵەتیەکان

پێویـستە ئەنجوومـەنی گـشتی بەشـداری بکـات لـە ئۆرگانیزمـە نێودەوڵەتیە پەیوەندیدارەکان بە تایبەتی لـەو بوارانـە کـە گرنگـی هەیــە بــۆ کاتالونیــا بەشــێوەیەکی ســەرەکی، یونــسکۆو ئۆرگانیزمەکانی کەلتوریی دی.

**ماددەی ( ٢٠٠ )**

## هەماهەنگی کردن لە کاروبارەکانی دەرەوە

پێویستە ئەنجوومەنی گشتی لە چوارچێوەی دەسـەڵاتەکانیدا، پـەرە بدات بە هەماهەنگی‌و هاوکـاری لـە کاروبارەکـانی دەرەوە لەگـەڵ کیانە ناوخۆیی‌و ئۆرگانیزم‌و کیانە نیشتمانیەکانی تری کاتالونیا بێ زیان گەیاندن بە سەربەخۆییان.

## ماددەی ( ٢٠١ )

## مۆرکی نێودەوڵەتی ڕێکخراوە کاتالانەکان

پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پەرە بە باری نێودەوڵەتی ڕێکخراوە کۆمەلایەتیو کەلتوریو وەرزشیەکانی کاتالونیا بداتو ئەگەر بە پێویستی زانی بچێتە ریزی ئەو کیانانەوە کە لە ئاستی نێودەوڵەتیدایەو لە چوارچێوەی جێبەجێکردنی ئامانجەکانی.

## دەروازەی شەشەم

## دەربارەی دارایی ئەنجوومەنی گشتیو هاوبەشکی کردنی کاتالان لە دارایی دەوڵەت

## بەشی یەکەم

## دارایی ئە نجوومەنی گشتی

## ماددەی ( ٢٠٢ )

## پرنسیپەکان

١- پەیوەندی نیزامی باج وەرگرتنو دارایی لەنێوان دەوڵەتو ئەنجوومەنی گشتی لە چوارچێوەی دەستووری ئیسپانیادا بە گوێرەی ئەم یاسایی بنەڕەتیەدا ڕێك دەخرێت.

٢- دارایی ئەنجوومەنی گشتی بە پێی پرنسیپەکانی سەربەخۆیو هەماهەنگیو، هاوکاریو شەفافیەت لە پەیوەندیە داراییو باجەکاندا لەنێوان ئیدارە گشتییەکاندا ڕێك دەخرێت.

٣- بەڕێوەبردنی بابەتەکانی ئەم دەروازەیە تایبەتە بە لیژنەی تێکەڵاوی کاروباری ئابووریو دارایی دەوڵەت- ئەنجوومەنی گشتی، بەپێی پرنسیپی دوو قۆڵی.

٤- لە حاڵەتی ڕوودانی ناکۆکی یاسایی لەگەڵ تەشریعاتەکانی دەوڵەتدا، بەپێی ئەم یاسایی بنەڕەتیەدا بەشێوەی هەڵبژاردەیی ئەم پرنسیپانە پەیڕەو دەکرێت.

**ماددەی (٢٠٣)**

## سەرچاوەکانی دارایی ئەنجوومەنی گشتی

١- ئەنجوومەنی گشتی دارایی سەربەخۆیی هەیەو سەرچاوەیەکی تەمویلی باشی لەبەر دەست دایە بۆ ممارەسەکردنی خودموختاری خۆی.

٢- ئەنجوومەنی گشتی سەربەخۆیی تەواوی هەیە لە خەرجیەکاندا و بە ئازادی سەرچاوەکان بەکاردەهێنێت بەگوێرەی ڕێنمایە سیاسیو کۆمەڵایەتیە دیاری کراوەکانی لەلایەن دامەزراوەکانی خودموختاری.

٣- سەرچاوەکانی دارایی ئەنجوومەنی گشتی پێك دێت لەمانەی خوارەوە:

أ- بەروبوومەکانی باجو رسوماتو گومرگو هاوبەشە تایبەتیەکانی خۆی.

ب- بەروبوومەکانی تێکڕای باجەکانی دەوڵەت کە لە کاتالونیا جێگیر بوونە بەپێی ئەوەی کە لە ئەم یاسایی بنەڕەتیەدا دیاری کراوە.

ج- باجە زیادەکانی سەر باجەکانی دەوڵەت.

د- داهاتەکانی سەرچاوەکانی هەرێمایەتی بەگوێرەی دەستووری ئیسپانی.

هـ- تمویلو هاوبشکەکانی دی کە لەسەر بودجەی گشتی دەوڵەت دایە.

و- داهاتی نرخە گشتییەکان.

ز- بەروبوومەکانی کەلەپوری ئەنجوومەنی گشتی.

ح- داهاتەکانی یاسایی تایبەتمەند.

گ- بەرهەمی دەرکردنی سنداتی قەرزو ئۆپەراسیۆنەکانی ئیتمان.

ن- ئەو داهاتانەی کە لە ئەنجامی غراماتو سزاکان وەدەست دێن لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی.

ك- ئەو سەرچاوانە کە لە یەکێتی ئەوروپاو پرۆگرامەکانی بازاڕی هاوبەشدا وەدەست دێن.

ل- هەر سەرچاوەیەکی دی کە لە ئایندەدا پەیدا دەبێت بەگوێرەی ئەم یاسای بنەڕەتیو دەستووری ئیسپانیا.

**ماددەی ( ٢٠٤ )**

## دەسەڵاتە دارایەکان

١- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە دیاری کردنی قەوارەو پێکهاتەی داهاتەکانی لە چوارچێوەی دەسەڵاتە دارایەکان.

٢- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی یاسایی بەرپرسیاریتی دارایی‌و باجی هەیە لەسەر تێکڕای ئەو باجانەی دەوڵەت کە لە کاتالونیا پاڵپشتی کراون لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی دەوڵەت‌و یەکێتی ئەوروپادا.

٣- ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لەسەر بەڕێوەبردن‌و وەرگرتن‌و تسویەکردن‌و پشکنینی تێکڕای ئەو باجانەی دەوڵەت کە لە کاتالونیا پالپشتی کراون.

**ماددەی ( ٢٠٥ )**

## ئاژانسی باجی کاتالونیا

١- بەڕێوەبردن‌و وەرگرتن‌و ساغ کردنەوەو پشکنینی تێکڕای ئەو باجانە کە لە کاتالونیا پالپشتی کراون، لە دەسەلاتی ئاژانسی باجی کاتالونیایە، تەنیا ئەوانە نەبێت کە مۆرکی ناوخۆیان هەیە.

٢- پێویستە ئاژانسی باجی کاتالونیا بە یاسای پەرلەمان دابمەزرێت‌و دەسەڵاتی‌تەواوی هەبێت لە ڕێکخستن‌و ممارەسەکردنی ئەو ئەرکانە کە لە بڕگەی یەکەمدا ئاماژەی پێ کراوە.

٣- ئاژانسی باجی کاتالونیا دەتوانێت ممارەسەی ئەرکەکانی بەڕێوەبردن بکات سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی بە باجە ناوخۆیەکانەوە هەیە لەڕێگای ڕێپێدان بە شاندە شارەوانیەکان.

**ماددەی ( ٢٠٦ )**

## ئۆرگانە ئابووری- ئیداریەکان

پێویستە ئەنجوومەنی گشتی لە ڕێگای ئۆرگانە ئابووری- ئیداریەکانی تایبەت بە خۆیەوە، ئەرکی پێداچوونەوە لە ئەستۆی خۆی بگرێت.

**ماددەی ( ٢٠٧ )**

## بەشداری کردنی کاتالان لە دارایی دەوڵەت

بەشداری کردنی کاتالان لە دارایی دەوڵەت پێك دێت لە هاوبەشی کردن لە خەرجیەکانی دەوڵەتو هاوبەشی کردن لە هاوکاریو لە میکانیزمەکانی هاوسەنگی، بەگوێرەی ماددەو بڕگەکانی ئەم دەروازەیە.

**ماددەی ( ٢٠٨ )**

## هاوبەشی کردن لە خەرجیەکانی دەوڵەت

کاتالونیا لەو بەشەی داهاتەکان، بۆی تەرخان کراوە هاوبەشی دەکات لە تمویل کردنی خزمەتگوزاریەکان بە گوێرەی ئەو ڕێوشوێنانەی کە لە ماددەی (٢١٠، ٢١٤)دا دیاری کراون.

**ماددەی ( ٢٠٩ )**

## هاوبەشی کردن لە (تچامن )و لە میکانیزمەکانی هاوسەنگی

ئەنجوومەنی گشتی هاوبەشی دەکات لە بواری هاوکاری و (تضامن) لەگەڵ کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکان بەو مەبەستەی کە ئەو خزمەتگوزاریانە پێشکەشی هاوڵاتیان بکرێت لەلایەن حکومەتە جیاجیاکانی کۆمەڵگا ئۆتۆنۆمیەکان بەو ئاست و قەوارەیە کە لە سنووری خۆیدا پێشکەش دەکات. هەر لەبەر ئەو مەبەستە، ئەنجوومەنی گشتی بە سەرچاوەکانی هاوبەشی دەکات لە میکانیزمەکانی هاوکاری بەگوێرەی دەستووری ئیسپانی.

**ماددەی ( ٢١٠ )**

## دیاری کردنی ئاست و قەوارە هاوبەشیەکانی کاتالان لە دارایی دەوڵەت

بۆ دیاری کردنی ئاست و قەوارەی ئەو هاوبەشیانەی کاتالونیا لە دارایی دەوڵەت پێویستە ئەم پێوەرانەی خوارەوە رەچاو بکرێت:

یەکەم: پێویستە، ئەوەی پەیوەندی بە هاوبەشی کردن هەیە لە خەرجیەکانی دەوڵەت کە لە ماددەی (٢٠٨)دا هاتووە، رێژەی بەشدار بوونی دابنرێت لەو بڕەی کە بۆ کاتالونیا تەرخان کراوە.

دووەم: پێویستە میکانیزمی دارایی دابنرێت بۆ هاوسەنگی گونجاو بە گوێرەی پرنسیپەکانی شەفافیەتو هاوسەنگی لەگەڵ ئەم پێوەرانەی خوارەوە:

أ- پێویستە، ئەو سەرچاوانەی کە دێتە ئەنجوومەنی گشتی یان وەردەگیرێت لەلایەن ئەوەوە بۆ هاوکاری کردن، بەگوێرەی پێداویستیەکانی دەسەڵاتی دارایی‌و باج دابنرێت.

ب- پێوەرەکانی یەکسانی بەگوێرەی رێژەی دانیشتوانو پێوەرەکانی خود بژێوی ئابووری پێوانە دەکرێن بە گوێرەی بەرهەمی خاوی ناوەخۆو رادەی باجی رێژەیی.

ت- پێویستە ئەنجامەکانی میکانیزمی هاوکاری لە ماوەی پلانی پێنج ساڵیدا بنرخێنن بۆ سەلماندنی کاریگەرەکانی.

**ماددەی ( ٢١١ )**

## چارەسەریی باجەکان

ئەنجوومەنی گشتی چارەسەریەکی باجی هەیە بە گوێرەی یاسا دانراوە بۆ دەوڵەت لە بواری باجەکانی دەوڵەتدا.

**ماددەی ( ٢١٢ )**

## بە واقیعی کردنی دارایی

أ- پێویستە دەوڵەتو ئەنجوومەنی گشتی میکانیزمی واقیعی کاریگەری پێنج ساڵی بۆ سیستەمی تمویلی دارایی دابنێت، بە

لەبەرچاوگرتنی بەرەوپێشچوونی سەرجەم سەرچاوە گشتییەکانی بەردەستو بەرفراوان بوونی پێداویستیەکانی خەرجیەکانی ئیدارە جیاجیاکان.

ب- پێویستە پیادەکردنی پێوەرەکانی هاوبەشی کردن لە دارایی دەوڵەت بخرێنە قۆناغی واقیعیەوە هەر پێنج ساڵ جارێک، بەگوێرەی ئەحکامەکانی ئەم یاسای بنەڕەتیە.

## ماددەی (٢١٣)

## ئەمانەت و دڵسۆزی بۆ دەستوور

دەوڵەت، بەگوێرەی پرنسیپی ئەمانەتی دەستووریی، پێویستە خود بژێوی سەرچاوەکانی دارایی ئەنجوومەنی گشتی زامن بکات.

## ماددەی (٢١٤)

## لیژنەی تێکەڵاوی کاروباری ئابووریو داراییەکانی دەوڵەت- ئە نجوومەنی گشتی

١) لیژنەی تێکەڵاوی بۆ کاروباری ئابووریو دارایی دەوڵەت- ئەنجوومەنی گشتی ئۆرگانی دوو قۆڵی پەیوەندییە لەنێوان ئیدارەی دەوڵەتو ئەنجوومەنی گشتی لە بواری تەویل کردنی ئۆتۆنۆمی. لە دەسەڵاتەکانی، پەرەپێدانو چاودێریو بەدواداچوونی سیستەمی داراییە. ئەم لیژنەیە پێکدێت لە ژمارەیەکی یەکسانی نوێنەرانی دەوڵەتو نوێنەرانی ئەنجوومەنی

گشتی. سەرۆکایەتی ئەم لیژنەیە بە نۆرە ممارەسە دەکرێت لەنێوان هەردوولادا لەماوەی ساڵێکدا. لیژنەکە پەیڕەوی ناوخۆیی دادەنێت بە ڕەزامەندی هەردوولا،

٢)ئەم لیژنەیە ئەم ئەرکانەی خوارەوەی دەبێت:

أ-دیاری کردنی رادەی بەشداری بوونی کاتالونیا لە دارایی دەوڵەت بەگوێرەی ئەحکامەکانی ماددەکانی (٢٠٧، ٢٠٨، ٢٠٩، ٢١٠).

ب- دانانی میکانیزمەکانی هاوکاری کردنی لەنێوان ئاژانسی باجی کاتالونیاو ئیدارەی باجی دەوڵەت کە لە ماددەی (٢٠٥)دا ئاماژەی پێ کراوە.

ج- گفتوگۆکردن لەسەر رێژەی بەشداربوونی کاتالونیا لە سەرمایە ئەوروپیەکان.

د- نرخاندنی خزمەتگوزاریەکانو دەسەڵاتەکان.

هـ- پەیڕەوکردنی ئەو میکانیزمانە کە لە ماددەی (٢١٢)دا هاتووە.

و- ڕەزامەندی دەبڕین لەسەر میکانیزمەکانی تمویل کردنی خەرجیە نەگونجاوەکان کە لە ماددەی (٢٢٣، ٥) ئاماژەی پێ کراوە.

ز- ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر گواستنەوەی خزمەتگوزاریەکانی لە دەوڵەتەوە بۆ ئەنجومەنی گشتی.

٣- پێویستە لیژنەی تێکەڵاو بۆ کاروباری ئابووریو دارایی رێوشوێنی هاوکاری شیاو دەستنیشان بکات بۆ زامن کردنی هاوسەنگی لە سیستەمی تمویل کردن کە لەم دەروازەیەدا دانراوە هەر کاتێ گۆڕانکاری بەسەر بڕیارە تەشریعیەکانی دەوڵەت یان یەکێتی ئەورووپا هات.

٤- لایەنی کاتالان لەو لیژنەیە تێکەڵاوە حسابات بۆ پەرلەمان رەوانە دەکات سەبارەت بە جێبەجێکردنی بڕگەکانی ئەم بەشە.

## بەشی دووەم

## بوودجەی ئەنجوومەنی گشتی

### ماددەی (٢١٥)

### دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی تایبەتمەندی هەیە بۆ رێکخستنو تەرتیب کردنی دارایی خۆی.

### ماددەی (٢١٦)

### بوودجەی ئەنجوومەنی گشتی

بودجەی ئەنجومەنی گشتی ساڵانەیە، تەنیا بودجەیەو پێکهاتووە لە تێکڕای خەرجیەکانو سەرجەم ئیراداتی ئەنجومەنی گشتی، هەروەها بریتییە لە بودجەی ئۆرگانیزمو دامەزراوەو ئەو کۆمپانیانە کە سەر بە ئەنجوومەنی گشتین. ئەرکی حکومەتی کاتالونیا

ئامـــادەکردنو جێبـــەجێکردنی ئـــەو بودجەیەیـــەو پەرلـــەمانیش گفتوگۆی لەسەر دەکاتو پاشان بەدەستکاریەوە پەسندی دەکات لە دوایـیـشدا کـۆنترۆڵی دەکـات. یاسـای بوودجـەکان ناتوانێـت بـاج دابنێت، بەڵام دەتوانێت دەسـتکاری باجـەکان بکـات بـە گـوێرەی یاسای باجەکان.

**ماددەی ( ٢١٧ )**

## سەرچاوەی قەرزکردن

١. ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت پەنابباتە بەر قەرزکردنو سنداتی قەرزی گشتی بۆ دابـین کردنـی خەرجیـەکانی وەبـەرهێنان لـە چوارچـێوەی دەسـەڵاتەکانی خـۆی بـەگوێرەی ئـەو پرنـسیپە گشتیانە کە دەوڵەت لەم بارەیەوە دایناوە.

٢. ئەو سندانەی کـە ئەنجوومـەنی گـشتی دەری دەکـات هـەمان کاریگـەری قـازانجو مەرجـەکانی هەیـە کـە دەوڵـەت دەری دەکات.

**ماددەی ( ٢١٨ )**

## سەقامگیریی بودجە

ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی هەیە لە دانانی سنوورو مەرجەکان بۆ وەدەست هێنانی مەبەستەکانی سەقامگیری بودجە لـە چوارچـێوەی ئەو پرنسیپە سەرەکیانە کە دەوڵەتو یەکێتی ئەورووپا دایناوە.

### ماددەی ( ٢١٩ )

## سەرو سامانی ئەنجوومەنی گشتی

١. سەرو سامانی ئەنجوومەنی گشتی پێکهاتووە لەو سەروەت و سامانە کە دەکاتە موڵکی گشتی.

٢. پێویستە یاسایەکی پەرلەمانی ئیدارەو چۆنیەتی پاراستن و مانەوەی سەرو سامانی ئەنجوومەنی گشتی رێك بخرێت.

### ماددەی ( ٢٢٠ )

## کۆمپانیا گشتییەکان ( حکومیەکان )

ئەنجوومەنی گشتی دەتوانێت کۆمپانیای گشتی دابمەزرێنێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی خۆیەتی، بەگوێرەی ئەو بڕگانەی کە لە یاساکانی پەرلەماندا هاتووە.

# بەشی سێیەم

# دارایی حکومەتە لۆکالەکان ( ناوچەیەکان )

### ماددەی ( ٢٢١ )

## پرنسیپە سەرەکیەکان

دارایی لۆکال بەپێی پرنسیپەکانی خود بژێوی سەرچاوەکانی یەکسانی و سەربەخۆیی و بەرپرسیارێتی دارایی رێك دەخرێت.

ئەنجوومەنی گشتی شەوغونی دەکات لەپێناو جێبەجێکردنی دەسەڵاتە داراییەکان.

**ماددەی (٢٢٢)**

## سەربەخۆیی و دەسەڵاتە داراییەکان

١. حکومەتە لۆکالەکان سەربەخۆیی لە بودجەو خەرجیەکانی هەیە سەبارەت بە پەیڕەوکردنی سەرچاوەکانیان، دەتوانێت لەو چوارچێوەیەدا بە ئازادی ئەرسەی دەسەڵاتەکانیان بکات.

٢. ئەنجوومەنی گشتی، لە چوارچێوەی دەستووری ئیسپانی، دەسەڵاتی هەیە لە بابەتی دارایی لۆکال. ئەو دەسەڵاتە لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە دەسەڵاتی تەشریعی بۆ دانان و رێکخستنی باجە تایبەتیەکانی حکومەتە لۆکالیەکان، دانانی پێوەرەکانی دابەش کردنی (مساهمات) لەسەر بودجەی ئەنجوومەنی گشتی.

٣. حکومەتە لۆکالیەکان دەسەڵاتیان هەیە لە بواری رێکخستنی دارایی تایبەتی خۆیان لە چوارچێوەی یاساکاندا. ئەو دەسەڵاتە بریتییە لە دەسەڵاتی دیاری کردنی پشک یان جۆری باجە لۆکالیەکان بەگوێرەی یاساکان.

٤. حکومەتە لۆکالیەکان بەگوێرەی یاساکانی سیستەمی باج وەرگرتن دەسەڵاتیان هەیە لە بەڕێوەبردن و وەرگرتن و پشکنینی

باجەکان، بەپێی زیان گەیاندن بە دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی، دەتوانن بەشداری بکەن لە ئاژانسی باجی کاتالونیا.

٥. ئەنجوومەنی گشتی دەسەڵاتی ئەمارەسەکردنی چاودێری دارایی هەیە لەسەر حکومەتە لۆکالیەکان، بە ڕاگرتنی ئەو سەربەخۆیە کە دەستووری ئیسپانی دەیپارێزێت.

**ماددەی (٢٢٣)**

## خود بژێوی لە سەرچاوەکان

١. پێویستە ئەنجوومەنی گشتی سندوقێکی هاوکاری و یارمەتی لۆکال دابمەزرێنێت بۆ حکومەتە لۆکالیەکان. ئەو سندوقە، کە سیفەتی مەرجداری نیە، پێویستە لە کۆی داهاتەکانی باجی فەرمی ئەنجوومەنی گشتی دابمەزرێت و لەڕێگای یاسایەکی پەرلەمانەوە ڕێك بخرێت.

٢. پێویستە داهاتەکانی حکومەتە لۆکالیەکان بەپێی یاساکانی دارایی کاتالونیا دابەش بکرێت بەگوێرەی ئەو پرنسیپانە کە دەوڵەت دیاری کردووە، یان ئەو بڕیارانە کە هێزی یاسایان هەیە کە لە ماددەی (٢١١) دا ئاماژەی پێ کراوە.

٣. پێویستە سەرچاوەی دارایی بەش زاڵمن بکرێت بۆ حکومەتە لۆکالیەکان لەپێناو پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکان.

٤. پێویـــــستە میکـــــانیزمی دارایـــــی شـــــیاو دابنرێـــــت بـــــۆ قەرەبووکردنەوەی حکومەتە لۆکالیەکان بۆ تەویـل کردنـی ئـەو خەرجیانە کە یاساکان بەشێوەیەکی تایبەتی پێیان نەداوە. ئـەو میکانیزمانە پێویستە لە چوارچێوەی مـاددەی (٢١٤) بڕگـەی (٢)دا چارەسەر بکرێت.

٥. دابەشکردنی ئەو سەرچاوانە لەنێوان حکومەتە لۆکالیـەکان لـە هیچ حاڵەتێکدا نابێتەکەمکردنەوەی ئەو سەرچاوانە.

## ماددەی (٢٢٤)

## یاسای دارایی لۆکال

١. پێویتـە پەرلـەمان یاسـای دارایـی لۆکـال پەسـند بکـات بـۆ پەرەپێدان بەو پرنسیپو بنەمایانە کە لەم بەشەدا دانراوە.

٢. پێویستە ئەو دەسەلاتانەی دارایی لۆکـال کـە لـەم بەشـەدا بـە ئەنجوومـەنی گـشتی دراوە، بـەپێی سـەربەخۆی لۆکـالو بـە ڕەزامەندی ئەنجوومەنی حکومەتە لۆکالیەکان کە لـە مـاددەی (٨٥)دا هاتووە ممارەسە بکرێت.

## ماددەی (٢٢٥)

## تۆمارگای خانووبەرەکان

ئەنجوومەنی گشتی، لە چوارچێوەی سنووری خۆیدا، دەسەڵاتی هەیە لە ڕێکخستنو بەڕێوەبردنی تۆمارەکانی خانووبەرە، بێ زیان گەیاندن

بە ئەرکی رێکخەریی دەوڵەت لە چوارچێوەی ئەو ئەحکامانـەی کـە لە دەستووری ئیسپانیادا هـاتووە، ئەنجوومـەنی گـشتی دەتوانێـت رێکەوتنامە ساز بدات لەگەڵ حکومەتە لۆکالیەکان بۆ بەڕێوەبردنی ئەم بابەتە.

## دەروازەی حەوتەم

## دەربارەی ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی

**ماددەی ( ٢٢٦ )**

**ریفۆڕمی ئەو دەروازانـە کـە کـار ناکەتـە پەیوەندیـەکانی لەگـەڵ دەوڵەت.**

١) ریفـۆڕمی دەروازەکـانی یەکـەمو دووەمـی یاسـای بنـەڕەتی پێویستە بەگوێرەی ئەم رێوشوێنانەی خوارەوە بێت:

أ- پێشنیار کردنی ریفۆرم لە دەسەلاتی پەرلـەمانی کاتالونیایـە، لەسەر پێشنیازی ١/٥ی ئەندامەکانی، حکومەتی ئەنجوومـەنی گشتی، شارەوانیەکانی کاتالونیاش دەتوانن پێشنیار بکەن بـۆ پەرلەمان بۆ ئمارەسەکردنی دەسـەڵاتی پێـشنیارکردنی ریفـۆرم ئەگـەر بـەلانی کەمـەوە ٢٠٪ ی شـارەوانیەکان داوا بکـەن. هـەروەها کۆکردنـەوەی ٣٠٠,٠٠٠ ئیمـزاش مـافی پێـشنیار کردنـی ریفـۆرمی هەیـە لـە رێگـای پەرلەمانـەوە. پێویـستە

پەرلەمان ئەو دوو ئیجرائاتە ڕێك بخات سەبارەت بە دەستپێشخەریەکانی ریفۆرم کردنی یاسای بنەڕەتی.

ب- پەسندکردنی ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی پێویستی بە دەنگی ۳/۲ی ئەندامەکانی پەرلەمان هەیە.

ت- ئەگەر لەماوەی سی ڕۆژدا، هەر لە ڕۆژی وەرگرتنی راوێژیی کە لە پیتی (ب) هاتووە، پەرلەمانی ئیسپانی ڕەزامەندی لەسەر ئەو ریفۆرمە بدات ئەوە پێویستە ئەو ئیجرائاتانە بەگوێرەی ماددەی (۲۲۷) ڕێچکەی خۆی بگرێت.

پ- هەر کاتێ ئەو ریفۆرمە لەلایەن پەرلەمانی ئیسپانیاوە تەسدیق بکرێت، پێویستە ئەنجوومەنی گشتی ئەو ریفۆرمە بخاتە بەر ریفراندۆم.

۲) ئەگەر ئەو پێشنیارە لەلایەن پەرلەمانەوە پەسند نەکرا یان لەلایەن دەستەی هەڵبژاردنەوە، ئەوە نابێت سەر لەنوێ بخرێتە بەر گفتوگۆو دەنگدانی پەرلەمانەوە تا ساڵێك.

## ماددەی ( ۲۲۷ )

## ریفۆرمی ئیکرای دەروازەکانی تری یاسای بنەڕەتی

۱- پێویستە ئەو بابەتانەی کە لە ماددەی (۲۲٦)دا نەهاتووە بەگوێرەی ئەم ڕێوشوێنانەی خوارەوە بێت:

أ- پەرلەمانو حکومەتی ئەنجوومەنی گشتیو پەرلەمانی ئیسپانی دەسەلاتی پێشنیار کردنی ئەو ریفۆرمەی هەیە. شارەوانیەکانو ئەوانەی دەنگیان بۆ پەرلەمان داوە مافیان هەیە پێشنیار بکەن بۆ پەرلەمان کە ممارەسەی پێشنیاری ریفۆرم بکات لە چوارچێوەی ناوەڕۆکی ماددەی (٢٢٧)، برگەی (١) ی (أ) دا.

ب- پەسند کردنی ئەو ریفۆرمە پێویستی بە دەنگی ٣/٢ی ئەندامانی پەرلەمان هەیەو لە پاشانیشدا پەرلەمانی ئیسپانی پەسندی دەکات لە رێگای یاسایەکی ئەساسیو لە کۆتایدا دەخرێتە بەر ریفراندۆمەوە.

ت- هەر کاتێ پێشنیاری ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی پەسند کرا، پێویستە پەرلەمان رەوانەی کۆنگریسی نوێنەرایەتی بکات.

پ- دەکرێت پێشنیارەکە بخرێتە بەر دەنگدانی کۆنگریسو ئەنجوومەنی پیران بۆ پەسندکردنی. پێویستە پەرلەمان شاندێك دیاری بکات بۆ پێشکەش کردنی ئەو پێشنیارە بە کۆنگریسو ئەنجوومەنی پیران. ئەگەر کۆنگریسی نوێنەرانو ئەنجوومەنی پیران پێشنیارەکەیان پەسند کرد ئەوە یاسای ئەساسیەکەش پەسند دەکرێت.

ج- ئەگەر ئەو رێوشوێنانەی برگەی پێشوو پەیرەو نەکرا، یان پێشنیاری ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی پەسندنەکرا، پێویستە

لیژنەی تێکەلاوی هاوسەنگ پێك بهێنن لە ئەندامانی لیژنەی پەیوەندیداری کۆنگریسی نوێنەرانو شاندی پەرلەمان لەگەڵ نوێنەرایەتی ڕێژەی گروپە پەرلەمانیەکان بۆ وەدەست هێنانی ڕێکەوتنی هاوبەش لە ماوەی دوو مانگدا.

ح- پێویستە ڕێوشوێنەکانی پێشنیارەکەی ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی لە ئەنجوومەنی پیران هەمان ڕێوشوێن بگرێتەبەر کەلە برگەی پێشوودا دەگیرێتەبەر بەگوێرەی پەیڕەوەی ناوخۆیی ئەنجوومەنی پیران.

خ-پێویستە شاندی پەرلەمان بە زۆرینەی دەنگی ۲/۳ی ڕەزامەندی بدات.

د- ئەگەر لیژنەی تێکەلاوی هاوسەنگ پێشنیاری هاوبەشی نەکرد، ئەوە پێویستە پێشنیاری ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی بەگوێرەی ئیجرائاتی ئاسایی پەیڕەو پرۆگرامی پەرلەمان بێت،

ژ- پەرلەمان بە زۆرینەی ڕەهای دەنگی ئەندامەکانی دەتوانێت ئەو پێشنیارانەی ریفۆرم بکێشێتەوە کە لە هەر قۆناغێکی ئیجرائاتی پەرلەمانی ئیسپانی پەسند دەکرێن.

ر- پەسندکردنی ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی لەلایەن پەرلەمانی ئیسپانی لە ڕێگای یاسایەکی ئەساسی دەبێتە مایەی

بانگەشەکردنی ریفۆراندۆم لەلایەن ئەنجوومەنی گشتی لە ماوەی شەش مانگدا، بەگوێرەی برگەی (أ، ب).

٢- ئەگەر ریفۆرمەکە لەلایەن پەرلەمانەوە، یان پەرلەمانی ئیسپانی یان دەستەی هەڵبژاردنەوە پەسند نەکرا، ئەوە ناکرێت سەرلەنوێ بخرێتە بەر گفتوگۆو دەنگدانی پەرلەمان تا بەسەرچوونی یەک ساڵ.

## بنەما پاشکۆیەکان

**یەکەم: دانپێدانانو بە واقیعی کردنی مافە مێژوویەکان**

١- لە رێگای ئەم یاسای بنەرەتیەوە، دان بە مافە مێژوویەکانی کاتالونیا دەنرێتو مۆرکێکی سەردەمیانەی پێ دەبەخشرێت بەگوێرەی یەکەم بنەمای پاشکۆیی دەستووری ئیسپانی.

٢- دانپێدانانو بە سەردەمیانەکردنی مافە مێژوویەکانی کاتالونیا، بەشێوەیەکی سەرەکی ئەم بوارانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

أ- نیزامی دارایی و دەروازەی شەشەم

ب- رێکخستنی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان، نیزامی یاسایی، نیزامی ئیجرائی، گرێبەند دامەزراوەیی مولکایەتی و بەرپرسیارێتی لە ئیدارە گشتییەکانی کاتالانو ئەرکی گشتیو میلاکی خزمەتگوزاریەکانی ئیدارە گشتییەکانی کاتالان (ماددەی ١١٢، ١١٣، ١١٤).

ت- ڕێکخستنی سنووری ئیداری کاتالۆنیاو نیزامی ناوخۆیی
(ماددەکانی ١٥٤، ١٥٥).

پ- یاسای مەدەنی (ماددەی ١٢٢).

ج- نیزامی زەمانەواتی لە کاتالۆنیا ماددەی (١٢٨).

ح- پەروەردە (ماددەی ١٢٥).

خ- کەلتوور (ماددەی ١٤٥).

د- ئاسایشی گشتی (ماددەی ١٦٣).

٣- دەستووری ئیسپانی مافە دەستوورییەکان و نیزامی بۆ هەلوتالی دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی گشتی دەپارێزێت و لە چوارچێوەی ئەحکامەکانی ئەم یاسای بنەڕەتییەدا زامنی دەکات.

**دووەم: دەستنیشان کردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران**

١- پەرلەمانی کاتالۆنیا دەسەڵاتی هەیە لە دەستنیشان کردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران کە نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی گشتی دەکەن لەو ئەنجوومەنەدا، لە چوارچێوەی یاسایەکدا کە لەلایەن زۆرینەی ڕەهای ئەندامانی پەرلەمانەوە پەسند دەکرێت لە دەنگدانێکی کۆتایی لەسەر تێکڕای دەقەکە.

٢- پەرلەمان، لەوڕێگای یاسایەکی پەسندکراو لە دەنگدانێکی کۆتایی لەسەر تەواوی دەقەکە بەزۆرینەی ڕەها، پێویستە ئەو بڕیارانەی کەوا پەیوەندییان بە هەڵبژاردنی پیرانەوە هەیە بگونجێت

لەگەڵ ریفۆرمی دەستووریی ئەنجوومەنی پیران لەو بابەتانەی کە پەیوەندی پێوە هەیە.

## سێهەم: گواستنەوەی دەسەڵاتەکان

١- ئەنجوومەنی گشتی لە چوارچێوەی ناوەڕۆکی برگەی (٢)دا ممارەسەی دەسەڵاتی ئەم بابەتانەی خوارەوە دەکات:

أ- دەسەڵاتەکانی بەڕێوەبردن لە بابەتی بەندەرەکانی بەرژەوەندی گشتی کە لە سنووری کاتالونیا دایە، لە هەموو حاڵەتێکدا بریتییە لە: جێبەجێکردنی تەشریعو سیاسەتی دەوڵەت لە بابەتی بەندەرەکانو بەڕێوەبردنو هەماهەنگی کردنو ئیدارە کردنی بەندەرەکانی بەرژەوەندی گشتی لە کاتالونیا لەگەڵ ئەو خزمەتگوزاریانەکە لە سنووریدا پێشکەش دەکرێن.

ب- دەسەڵاتەکانی دەوڵەت لەبواری بەڕێوەبردنی ئەو فڕۆکەخانانەی بەرژەوەندی گشتی کە لە سنووری کاتالونیا دایە.

ت- دەسەڵاتەکانی بەڕێوەبردنی ژێرخانی هۆیەکانی تەلو بێتەل کە لە سنووری کاتالونیا دایە، کە بریتییە لە دەسەڵاتی گشتی لەسەر رادیۆو ئەلکترۆنیك.

پ- راگەیاندنی راپرسی لە رێگای ریفراندۆمەوە، تەنیا ئەو بابەتانە نەبێت کە لە دەستووری ئیسپانی دراوەتە دەوڵەت.

ج- دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردنی تەشریعی دەوڵەت سەبارەت بە مانەوەو نیشتەجێبوونی بیانیەکان.

ح- دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردنی تەشریعی دەوڵەت کە پەیوەندی بە بابەتی نیزامی سزایی بیانیەکانەوە هەیە.

خ- هەڵبژاردنی ئەو کرێکارە بیانیانە کە لە وڵاتە رەسەنەکانی خۆیانەوە کە دێنە کاتالونیا بۆ کارکردن.

د- جێبەجێکردنی تەشریعی دەوڵەت لە بابەتی هاتوچۆو سوڕانەوەی ماشێنو ئاسایشی ڕێگاوبانەکان لە کاتالونیا.

ژ- ڕێکخستنی مەرجەکانی قەبوڵ کردنو یەکسانی کردنی بڕوانامە ئەکادیمیو پیشەیەکان.

ر- دیاری کردنی پسپۆرایەتی هەرێمایەتی ئۆرگانە دادوەریەکانی کاتالونیاو میلاکاتی دادوەریی.

**چوارەم:**

## ناکۆکیەکانی نێو لیژنەی تێکەڵاوی گواستنەوەی دەسەڵاتەکانی دەوڵەتو ئەنجوومەنی گشتی.

پێویستە ئەو ناکۆکیانە لە ڕێگای ئەو ڕێوشوێنانە کە لە یاسای ئەساسی دادگای دەستووری دیاری کراوە چارەسەر بکرێن.

## پێنجەم:
## رێکەوتنامەکان لەگەڵ حکومەتی ناوەندی

ئەگەر یاسای بنەرەتی بڕیار بدات کە پێگەی حکومەتی ئەنجوومەنی گشتی یەکلای کەرەوە بێت بۆ ئەنجام دانی رێکەوتنامە لەگەڵ حکومەتی ناوەندیو ئەویش پێشوازی لەو بڕیارە نەکات، ئەوە پێویستە حکومەتی ناوەندی هۆیەکانی ئەو پێشوازی نەکردنە روون بکاتەوەو پێویستە لیژنەی دوو قۆڵی ئەنجوومەنی گشتی-دەوڵەت کۆبێتەوە.

## شەشەم:
## پێداچوونەوە بە نیزامی تایبەتمەندی دۆڵی ئاران

هەر لە رۆژی بەرکاربوونی ئەم یاسای بنەرەتیە، لەماوەی چوار ساڵدا، پێویستە نیزامی تایبەتمەندی دۆڵی ئاران پێداچوونەوەو دەستکاری لێ بکرێت بۆ ئەوەی بە گوێرەی پێویست، تەکیف بکرێت لەگەڵ ناوەرۆکی ئەم یاسای بنەرەتیە.

**حەوتەم:**

ئەنجوومەنی گشتی نوێنەرایەتی ئیدارەی ئاسایی دەوڵەت دەکات لە کاتالونیا پاش ئەوەی دەسەڵاتەکانی بۆ بگوازرێتەوە لە رێگای ئامرازەکانی پەیوەندیدار، ئەنجوومەنی گشتی ئەرکی

جێبەجێکردنی ئیداری دەوڵەت ممارەسە دەکات لە ڕێگای ئۆرگانە هەرێمایەتیەکان لە کاتالونیا.

## بنەما ئینتیقالیەکان

**یەکەم:**

**تەکیف کردنی یاساو ئەو بڕیارانە کە هێزی قانوونیان هەیە**

١- یاساکانی پەرلەمانو ئەو بڕیارانەی حکومەت کە هێزی یاساییان هەیەو بەرکارن لە کاتی بەرکاربوونی ئەم یاسای بنەڕەتیەدا بۆ ماوەی دوو ساڵ بە لانی کەمەوە بەردەوام دەبن، لەو ماوەیەدا پێویستە لەگەڵ تەشریعەکانی ئەم یاسای بنەڕەتیەدا تەکیف بکرێن.

٢- گروپە پەرلەمانتاریەکان، ئەندامانی پەرلەمان، حکومەتو سەندیکای دادوەران، لەو ماوەیەدا کە لە بڕگەی یەکەمدا دیاری کراوە، دەتوانن ڕاوێژی بە "ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری" بکەن لە چوارچێوەی یاسادا، دەربارەی دەستووریەتی یاساکانی پەرلەمان لەگەڵ یاسای بنەڕەتی، یان ئەو بڕیارانەی حکومەت کە هێزی یاساییان هەیە بەر لەوەی بخرێتە خانەی بەرکاربوونەوە.

**دووەم:**

## بەرکار بوونی بنەما ئینتیقالیەکانی پێشوو

بنەما ئیتقالیەکانی سێهەم، چوارەمو شەشەمی یاسای ئەساسی ٤/ ١٩٧٩ی ١٨ دیسەمبەر، یاسای بنەڕەتی ئۆتۆنۆمی کاتالونیا، وەکو خۆی بەرکار دەبێت وەکو تەشریعی ئینتیقالی.

**سێهەم:**

## پێوەری پەیوەندیداری دەسەڵاتە هاوبەشەکان

سەبارەت بە دەسەڵاتە هاوبەشەکان، تا دەوڵەت تەشریعی سەرەکی دەرنەکات بەشێوەی پرنسیپی بابەتی یان ئیستانداری، پێویستە ئەنجوومەنی گشتی پێوەری سەرەکی بەرکار یەکلایی بکاتەوە.

## بنەما کۆتایەکان

**یەکەم:**

**سیستەمی تمویل کردنی ئەنجوومەنی گشتی**

١- ئەنجوومەنی گشتیو دەوڵەت لەماوەی ساڵێکدا هەر لە ڕۆژی بەرکاربوونی ئەم یاسای بنەڕەتیەدا، پێویستە ڕێکەوتن ساز بدەن لەسەر سیستەمی تمویل کردنی ئەنجوومەنی گشتی، لە میانەی دەقەکانی ئەم یاسای بنەڕەتیە و هەروەها لەسەر قەرەبووکردنەوەی دارایی ڕێك بکەون.

٢- پەیڕەو کردنی سیستەمی دارایی کە لە بڕگەی یەکەمدا ئاماژەی پێ کراوە، دەکرێت بەشێوەی پەیژەیی جێبەجێ بکرێت بە ڕەچاوکردنی

باری دارایی وڵات، لە هەموو حاڵەتێکدا پێویستە لە ماوەی (٥) پێنج ساڵدا پەیڕەو بکرێت.

دووەم:

## دیاری کردنی پێداویستەکانی خەرجی

پێویستە سیستەمی دارایی (تمویل کردن) بە گوێرەی بنەمای کۆتایی یەکەم دابنرێت بۆ دیاری کردنی پێداویستیەکانی خەرجی کە لە ماددەی (٢٠٢، ٢، أ) ئاماژەی پێ کراوە. پێویستە وەکو بنەمای سەرەکی- رەچاوی رێژەی دانیشتووانو کۆچبەرانو رووبەرو شارو شارستانیەتو ژمارەی کەسەکانو خەرجیە جیاجیاکانی کۆمەڵایەتیو جیاوازیان لەگەڵ وڵاتانی پێشکەوتوو بکرێت.

سێهەم:

## ئاژانسی باجی کاتالونیا

پێویستە ئەو (ئاژانسی باجی کاتالونیا) کە لە ماددەی (٢٠٥) دا ئاماژەی پێ کراوە، بە یاسایەکی پەرلەمانی دابمەزرێت لەماوەی ساڵێکدا هەر لە رۆژی بەرکاربوونی ئەم یاسای بنەڕەتیە، تا ئەو کاتەی کە ئەو ئاژانسە دروست دەبێت، ئەرکەکانی لەلایەن "ئاژانسی دەوڵەت بۆ ئیدارەی باجەکان" و ئیدارەی باجی ئەنجوومەنی گشتی ممارەسە دەکرێت.

## چوارەم:

## ماوەی پێکهێنانی لیژنەی تێکەڵاوی پەیوەندیـەکانی بـاج و دارایی دەوڵەت- ئەنجوومەنی گشتی

لیژنەی تێکـەڵاوی پەیوەندیـەکانی دارایـی دەوڵـەت- ئەنجوومـەنی گشتی کە لە ماددەی (٢٠٥) دا هاتووە، پێویستە لەماوەی شـەش مانگـدا پێـك بهێنرێـت هـەر لـە ڕۆژی بـەرکاربوونی ئـەم یاسـای بنەڕەتیە، تا ئەو کاتە، لیژنـەی تێکـەڵاوی خەمڵانـدنی دەوڵـەت- ئەنجوومەنی گشتی بەو ئەرکانە هەڵدەستێت. هەر بـە دامەزرانـدنی ئەو لیژنەیە، لیژنەی تێکەڵاوی خەمڵاندنی دەوڵـەت- ئەنجوومـەنی گشتی یەکسەر کۆتایی بە کارەکانی دێنێت.

## پێنجەم:

## پەیوەندی کیانە ئابووری و داراییەکان

لیژنەی تێکەڵاوی پەیوەندیەکانی دارایی و تمویـل کردنـی دەوڵـەت- ئەنجوومـەنی گـشتی لـە مـاوەی شـەش مانگـدا هـەر لـە ڕۆژی بەرکاربوونی ئەم یاسای بنەڕەتیەدا پێویـستە دەستنیـشانی جـۆری پەیوەندی لەنێوان کیانەکان بکات کە لـە ماددەکـانی ئـەم یاسـای بنەڕەتیەدا ئاماژەی پێ کراوە.

## من مطبوعات
## المجلس الوطني لكوردستان - العراق
## لجنة الشؤون القانونية

١- دەستوری ئیسپانی١٩٧٨.
٢- دستور اتحاد بوسنيا هيرزو كوفينيا لعام ١٩٩٤.
٣- دستور جمهورية جنوب افريقيا لعام ١٩٩٦.
٤- القانون الاساسي لجمهورية المانيا الاتحادية ١٩٤٩ و تعديلات لغاية ٢٠٠٢.
٥- دستور إتحاد جزر القمر لعام ٢٠٠٢.
٦- دستور الامارات العربية المتحدة لعام ١٩٧١.
٧- مكافحة الفساد (من اين لك هذا؟).
٨- چەند وێستگەیەك لە نووسینەوەی دەستوری فیدراڵی عێراقدا.
٩- الحالة الخاصة لاقليم سيسيليا (الصقلية) احد اقاليم الجمهورية الايطالية مع متن الدستور الايطالي.
١٠- دەستوری مەکسیك (١٩١٧).
١١- دستور الهند ١٩٤٩ و تعديلاته لغاية ١٩٩٥.
١٢- خودموختاری هەرێمایەتی بۆ کەمینە نەتەوەییەکان لە چین (٢٠٠٦).
١٣- یاسای وەبەرهێنان لە هەرێمی کوردستان (قانون الاستثمار في اقليم كوردستان - العراق) ٢٠٠٦.
١٤- دەستوری نیکاراگوا (١٩٨٧).
١٥- دەستوری سیاسی کۆماری ڤەنزویلا (١٩٧١).
١٦- دەستوری ئوسترالیا (١٩٠٠).
١٧- دستور ولاية كاليفورنيا لسنة (١٨٤٨).
١٨- قانون مكافحة الإرهاب ٢٠٠٦.
١٩. اللغات الرسمية في كندا سنة ١٩٨٨.